

چاپی چوارەم

# بەسەرهاتی پێغەمبەران

## لە ئادەم پێغەمبەرەوە تا موحەممەد پێغەمبەر

سەلامی
خودایان
لەسەربێت

ئامادەکردنی: هیوا عبدالرحمن

سەلامی
خودایان
لەسەربێت

لە ئادەم پێغەمبەرەوە تا محەمەد پێغەمبەر

# بەسەرهاتی پێغەمبەران

ئامادەکردنی: هیوا عەبدوڕڕەحمان






**ناوەندی ڕۆشنبیریی ئەدیبان**

بەڕێوەبەری گشتی: ئارامی مەلا محەمەد

ناونیشان: سلێمانی، شەقامی ئیبراهیم پاشا، فولکەی گۆزەکان، نزیك ناوەندی ڕۆژهەڵاتی کوردان

پەیوەندی: 07701974656 - 07501590032 - 07731974846 - 07501696369

**Email:** bookadiban@gmail.com

**Facebook:** https://www.facebook.com/eadiban/

## ناسنامەی کتێب

**ناونیشان:** بەسەرهاتی پێغەمبەران

**نووسین و ئامادەکردنی:** هیوا عەبدوررەحمان

**بابەت:** ئاینی

**نۆرەی چاپ:** چاپی سێیەم

**دیزاینی بەرگ و دەق:** ئارام مەلا محەمەد

**پەخشانگە:** ناوەندی ڕۆشنبیریی ئەدیبان

# چیرۆکی ئادەم پێغەمبەر ﷺ

خوای گەورە هەواڵی بە فریشتەکان دا کە دەیەوێت مرۆڤ لەسەر زەوی دروست بکات، ئەوانیش وتیان: خوای گەورە تۆ مرۆڤ لەسەر زەوی دروست دەکەیت کە خراپە لەسەر زەویدا بڵاودەکاتەوە؟ خوای گەورەش فەرمووی من شتێك دەزانم کە ئێوە نایزانن.

خوای گەورە فەرمانی بە فریشتەکان کرد کە بڕۆن هەندێك خاك خۆڵ کۆبکەنەوە، پاشان ئەو خاك و خۆڵەی لەگەڵ ئاودا تێکەڵکرد و قوڕێکی لێ دروست بوو، لەو قوڕەش مرۆڤێکی دروستکرد، پاشان ڕۆحی کرد بە بەری ئەو مرۆڤەدا و بەم شێوەیەش خوای گەورە ئادەمی دروستکرد.

خوای گەورە ویستی هەندێك لە حیکمەتەکانی دروستکردنی ئادەم پیشانی فریشتەکان بدات، بۆیە ناوی هەموو شتەکانی فێری ئادەم کرد.



هەروەها وێنەی ئەو شتانەشی پیشانی فریشتەکاندا و فەرمووی: ئادەی ناوی ئەو شتانەم پێ بڵێن، بۆیە ئەوانیش کە ناوی شتەکانیان نەزانی، هەموویان وتیان: خودای گەورە تۆ پاك و بێگەردیت و ئێمە هیچ شتێك نازانین تەنها ئەوە نەبێت کە خۆت فێرمان دەکەیت، هەر تۆ خۆت زانایت و لە هەموو کارێکدا خاوەن حیکمەتیت.

ئادەمیش لەلای فریشتەکان ناوی شتەکانی وت، فریشتەکانیش سەریان سوڕما کە ئادەم ئەو هەموو شتە دەزانێت و ئەمان نایزانن. خوای گەورەش فەرمووی من هەموو ئەو شتانە دەزانم کە ئێوە نایزانن.

پاشان خوای گەورە بە فریشتەکانی فەرموو سوجدە بۆ ئادەم ببەن ﴿دیارە ئەو سوجدەیە سوجدەی ڕێز بووە﴾، ئەوانیش سوجدەیان بۆ ئادەم برد تەنها ئیبلیس نەبێت، کە خۆی بەگەورە زانی و بێ فەرمانی خوای گەورەی کرد.



خوای گەورەش لە ئیبلیسی پرسی: «لە کاتێکدا کە خۆی باشتر دەزانێت» و فەرمووی: بۆچی سوجدەت بۆ ئادەم نەبرد؟

ئیبلیسیش وتی: چونکە تۆ منت لە ئاگر دروستکردووە و ئادەمیشت لە قوڕ دروستکردووە، ئاگریش لە قوڕ باشترە، خوای گەورەش نەفرینی لە ئیبلیس کرد و لە ڕەحمەت و میهرەبانی خۆی دەریکرد، ئادەمیش لە بەهەشتدا دەژیا و پاش ماوەیەك هەستی بەتەنیایی دەکرد، بۆیە خوای گەورەش «حەووا»ی هاوسەری بۆ دروستکرد، تاکو لە بەهەشتدا ژیانێکی خۆش بژین و دڵخۆشبن، خوای گەورە لە بەهەشتدا هەرچی خواردن و خواردنەوەکان بوو بۆی حەڵاڵکردن تەنها خواردنی بەروبوومی یەك درەخت نەبێت کە لێی قەدەغەکردن، چونکە بەر تووڕەیی خوای گەورە دەکەون، ئاگاداریشی کردنەوە کە ئیبلیس دوژمنتانە و خۆتانی لێ بەدوور بگرن.



ئیبلیسیش ئەم هەلەی قۆستەوە بۆ ئەوەی ئادەم و حەووا لەخشتەبەرێت، بۆیە بە ئادەم و حەووای وت: ئەوە درەختی نەمرییە و هەرکەسێك لەو درەختە بخوات هەرگیز نامرێت، ئەوانیش لەبیریانچوویەوە کە ئیبلیس دوژمنیانە، بۆیە سەرپێچی خوای گەورەیان کرد و لە درەختەکەیان خوارد، بەمەش خوای گەورە لە بەهەشت دەریکردن و فەرمانی پێکردن کە دابەزنە خوارەوە بۆ سەر زەوی، ئادەم و حەووایش زۆر پەشیمان بوونەوە و داوای لێخۆشبوونیان لە خوای گەورە کرد، خوای گەورەش لێیان خۆشبوو و ئاگاداری کردنەوە کە شەیتان دوژمنتانە و هێمای شەڕ و خراپەیە، چونکە ئەو بووە هۆی ئەوەی لە بەهەشت دەرکران. پاشان ئادەمیش ﷷ بۆی دەرکەوت کە شەیتان دوژمنی سەرسەختیانە.



بەمەش سەرەتای ژیان لە سەر زەویدا دەستیپێکرد و خوای گەورە چەند منداڵێکی بە ئادەم و حەووا بەخشی، دووکوڕیان هەبوو، یەکێکیان ناوی ﴿هابیل﴾ و ئەوەی تریان ناوی ﴿قابیل﴾ بوو، هابیل کەسێکی چاکەخواز و نەرم و نییان بوو، بەڵام براکەی کەسێکی شەڕەنگێز و خراپ بووە و کێشەی لەگەڵ هابیلدا دروستدەکرد.

پاشان هەریەکێکیان بۆ نزیکبوونەوە لە خوای گەورە قوربانییەك پێشکەش دەکەن، هابیل خاوەنی ڕانە مەڕێك دەبێت، قابیلیش خەریکی کشتوکاڵ کردن دەبێت، بۆیە هابیل کە خاوەنی دڵێکی باشە.

باشترین و قەڵەوترین مەڕ دەهێنێت و قابیلیش ئەو گەنم و کشتوکاڵەی کردوویەتی بەشێکی خراپی دەبات بۆ قوربانیکردن بۆ خوای گەورە.



خوای گەورەش بەشە باشەکەی هابیل وەردەگرێت و ئەوەی قابیل وەرناگرێت کە بەشێکی خراپە، دوای ئەوەش شەیتان قین و حەسادەت دەخاتە دڵی قابیل و ئیرەیی بەرامبەر بە براکەی زیاتر دەکات و ڕقی لێی دەبێتەوە.

لەکۆتاییدا قابیل هەڕەشە لە براکەی دەکات و پێی دەڵێت: دەتکوژم. هابیلیش زۆر بەهێمنی دەڵێت: ئێمە براین ئەگەر تۆ هەڕەشەی ئەو کارە لە من دەکەیت ئەوا من هەرگیز کاری وا



ناکەم، بۆیە لەکۆتاییدا قابیلی خراپ و شەڕەنگێز هابیل دەکوژێت. دوای ئەو کارە پەشیمان دەبێتەوە و زۆر خەمبار دەبێت و نازانێت چی لە لاشەکەی بکات، خوای گەورەش دوو قەلەڕەش دەنێرێت کە شەڕیان دەبێت و یەکێکیان ئەوەی تریان لەناودەبات، پاشان بە دەنووکی و بە قاچەکانی چاڵێکی بۆ هەڵدەکەنێت و دەیشارێتەوە، قابیلیش لەمەوە فێردەبێت کە چاڵێك هەڵبکەنێت و لاشەی براکەی بشارێتەوە.

ئەم کارەی کە قابیل ئەنجامی دا یەکەم کاری خراپە بوو لەسەر زەویدا ئەنجامدرا.



کاتێـك ئادەم پێغەمبەرﷺ ئەم هەواڵەی بیسـت زۆر خەمبـار و خەفەتبـار بـوو کـە یەکێك لـە کوڕەکانی کارێکـی وا خراپی ئەنجامـداوە و شـەیتان فریویـداوە. هەروەهـا قابیلیـش دوای ماوەیەك دەمرێت.

دواتـر خـوای گـەورە کۆمەڵێـك منداڵـی بـاش بـە ئـادەم پێغەمبـەرﷺ دەبەخشێت و تەمەنێکی درێژ دەژی و بەردەوام ئامۆژگاری منداڵەکانیشی دەکات، پاشـان لـە کۆتایـی و لـە سـەرەمەرگیدا ئـادەم پێغەمبـەرﷺ منداڵەکانـی کۆدەکاتـەوە و هەندێـك وەسـیەتیان بـۆ دەکات کـە سـوودی بـۆ دنیـا و قیامەتیشـیان دەبێـت و ئاگاداریـان دەکاتـەوە کـە سـەرپێچی فەرمانەکانـی خـوای گـەورە نەکـەن و گوێڕایـەڵ و فەرمانبـەرداری خـوای گـەورە بـبن. دواتریـش ئـادەمﷺ کۆچـی دوایـی کـرد.



# چیرۆکی نووح پێغەمبەر ﷺ

پاش تێپەڕبوونی ماوەیەك دوای كۆچی دوایی ئادەم پێغەمبەر ﷺ چەند كەسێك هەبوون كە پیاوچاك بوون و ناوبانگیان بە چاكەكاری دەركردبوو و خەڵكی زۆر خۆشیان دەویستن، دوای كۆچی دواییان خەڵكی زۆر خەمباربوون، بۆیە بڕیاریاندا پەیكەریان بۆ دروست بكەن، پاشان چەند نەوەیەك دوای ئەوان هاتن و ڕۆیشتن، ئیتر چەند نەوەیەكی هاتن كەوتنە پەرستنی ئەو بتانە و پەرستش و عیبادەتیان بۆ دەكردن و بت پەرستی بڵاوبووەوە.حەزرەتی نووحیش ﷺ كەسێكی بەڕێز بوو لە ناو گەلەكەی خۆیدا و بیری دەكردەوە كە نەكەوێتە ئەو گومڕایی و سەرلێشێواوییەی گەلەكەی، بۆیە خوای گەورە خستییە سەر ڕێگەی ڕاستی خوداناسین و پەیامی بۆ نارد و وەكو پێغەمبەری خۆی هەڵیبژارد و ڕەوانەی كرد بۆ گەلەكەی.



ئەوەیش لەو کاتەدا بوو کە خەڵکی کەوتبوونە بت پەرستی و خوای گەورەیان بە تەنهایی نەدەپەرست و بە تەواوەتی گومڕا بووبوون.

خوای گەورە لەبەر ئەوە نووحی هەڵنەبژارد کە دەوڵەمەند بوو یان دەستەڵاتداربوو، نەخێر، تەنها لەبەر ئەوە بوو کە خاوەنی دڵێکی پاك بوو و. کەسێکیش بوو کە بەردەوام لە هەموو کاتەکانی خواردن و خواردنەوە و لەبەرکردنی پۆشاك و چوونەدەرەوە لەماڵ و گەڕانەوەی بۆ ماڵەوە، بە بەردەوامی سوپاسی خوای گەورەی دەکرد، خوای گەورە ناردی بۆ ئەوەی کە خەڵکی بانگ بکات بۆ پەرستنی خوای گەورە بە تەنهایی تاکو هاوەڵ بۆ خوای گەورە دانەنێن.

نووح پێغەمبەریشﷺ بانگەوازی بۆ گەلەکەی دەکرد تاکو خودا بپەرستن و واز لە بتەکان بهێنن، ئامۆژگاری دەکردن و دەیوت بیربکەنەوە و سەیری دەسەڵاتەکانی خوای گەورە بکەن.



هەروەها بۆ ماوەی نزیکەی هەزار ساڵ بە بەردەوامی
و بە شەو و ڕۆژ و بە نهێنی و بە ئاشکرا بە بێوچان و ماندووبوون
داوای لە گەلەکەی دەکرد و بانگی دەکردن بۆ لای خوای گەورە و ڕێگەی ڕاست و دروست و لە فێڵەکانی شەیتان ئاگاداری دەکردنەوە کە ئیتر واز لە بت پەرستی و لە هەنگاوەکانی شەیتان بهێنن و شوێنی نەکەون.

جگە لە کەمێکی خەڵکی نەبێت زۆری گەلەکەی شوێنی نەکەوتن و وەڵامیان نەدایەوە و دژایەتیشیان دەکرد، تەنانەت ژنەکەیشی و یەکێك لە کوڕەکانیشی بڕوایان پێ نەهێنا، ئەوانەی کە بڕوایان پێ نەدەکرد دەیانوت: کە تەنها کەسانی هەژار و لاواز شوێنی تۆ کەوتوون، ئێمە بڕوات پێ ناکەین و شوێنکەوتەی تۆ نابین.



ئەگەر دەتەوێت ئێمەش شوێنی تۆ بکەوین ئەوا دەبێت ئەو هەژار و لاوازانە دەربکەیت، لە کاتێکدا ڕاستیان نەدەکرد، چونکە تەنها دەیانویست شوێنکەوتووانی نووح پێغەمبەر ﷺ کەم بکەنەوە و کەس شوێنی نەکەوێت.

ئەو کەسانەی کە بڕوایان پێی نەبوو گاڵتەیان پێ دەکرد و قسەی ناشیرینیان پێ دەوت و دەیانوت: تۆ کەسێکیت کە گومڕا و سەرلێشێواویت، نووحیش ﷺ بە شێوەیەکی زۆر جوان وەڵامی دەدانەوە کە دەیفەرموو: من کەسێکی گومڕانیم، من پێغەمبەر و ڕەوانەکراوی خوای گەورەم تاکو ئێوە بانگ بکەم بۆ لای خودا و یارمەتیتان بدەم تاکو تەنها ئەو بپەرستن.

هەموو بێبڕواکانی بە تەواوەتی دژایەتییان دەکرد و ئیرەیی و کینە لە دڵ بوون بەرامبەری.



تەنانەت بە شێوەیەك گومڕا و سەرسەخت بوون

کە گەیشتە ئەوەی کاتێك نووحﷺ ئامۆژگاری دەکردن ئەوان پەنجەیان دەئاخنییە گوێچکەکانیان تاکو گوێیان لە دەنگی نەبێت و بە جلەکانیان ڕووی خۆیان دادەپۆشی تاکو هەر نەیبینن و بانگەوازەکەی نەبیستن.

ئەم کارانەشیان بۆ ماوەیەکی زۆر دوور و درێژ بەردەوام بوو، تاکو ئیتر تەواو بەگوێیان نەکرد و دژایەتییان دەکرد و دەیانوت ئەو سزایەی کە خودا بۆمان دادەنێت با بێتە سەرمان و ئیتر سزامان بدات، بەڵام گەورەمان نووح پێغەمبەرﷺ لەم قسانەیان بێتاقەت دەبوو و خەفەتی دەخوارد، بەڵام هەر بێهیوا نەبوو و هەر بە نەرم و نیبانی داوای لێیان دەکرد کە تەنها خودا بپەرستن.



ئەمانە بە بەردەوامی بۆ ماوەی نزیکەی هەزار ساڵ بەردەوام بوو، کە تەنها هەندێکی کەم لە لاواز و هەژارەکان نەبێت کەسیان شوێنی نەکەوتن، خوای گەورەش نووحی ئاگادارکردەوە کە ئیتر کەسی تریان شوێنت ناکەون، بۆیە نووح پێغەمبەریش ﷺ داوای لە خوای گەورە کرد کە ڕزگاریان بکات.

خوای گەورەش فەرمانی پێکرد کە کەشتییەکی گەورە دروست بکات، نووح پێغەمبەریش ﷺ لەگەڵ بڕوادارەکاندا دار و تەختەیان ئامادە دەکرد و خەریکی دروستکردنی کەشتییەك بوون، بێبڕواکانیش کە بەلایاندا دەڕۆیشتن گاڵتەیان پێدەکردن لەم شوێنە وشکەدا کە هیچ ئاوی لێ نییە کەشتیتان بۆ چییە؟ هەروەها بە بەردەوامیش قسەیان پێ دەوتن.



نووح پێغەمبەرو ﷺ بڕواداره‌كان بەردەوام بوون لە کارکردن، تاکو ئەوەی دروستکردنی کەشتییەکەیان تەواوبوو، ئیتر کاتی ئەوە هات کە لافاوێکی گەورە بێت و هەموو بێبڕواکان لە ناوبەرێت، خوای گەورە فەرمانی بە بڕوادارەکان کرد کە سواری کەشتییەکە ببن و لە هەموو نێر و مێیەکی گیانلەبەرەکانیش جووتێکیان خستە ناو کەشتییەکەوە.

خوای گەورەش فەرمانی بەئاسمان کرد کە باران ببارێنێت و لە زەویشەوە ئاو زیادیکرد و بەرزبووەوە، تاکو ئەوەی لە ناو تەنووریشەوە ئاو هەڵدەقووڵا، بێبڕواکانیش هەوڵیان دەدا هەڵبێن و بچنە سەر لوتکەی چیاکان، بەڵام لافاو هەموو شوێنەکانی گرتەوە و هەموویان لەناوچوون.



لەو کاتەدا کە لافاو زۆربوو نووح پێغەمبەر ﷺ کوڕەکەی بینی کە هەوڵی خۆڕزگارکردن دەدات، بانگی لە کوڕەکەی کرد کە وەرە و سواری کەشتییەکە بە تاکو ڕزگارت ببێت، بەڵام کوڕەکەی لە گومڕاکان بوو و وتی: دەچمە سەر ئەو شاخە و ڕزگارم دەبێت، بەڵام لافاو هەموو شوێنێکی گرتەوە و هەموو بێباوەڕ و گومڕاکان لەناوچوون و خنکان.

دوای ئەوە خوای گەورە فەرمانی کرد کە ئاسمان بارانەکە خۆشبکاتەوە و لافاوەکەش لەسەر زەویش نەمێنێت و تەواو ببێت.



کەشتییەکەش لە شوێنێك نیشتەوە ناوی کێوی
﴿جوودی﴾یە، کە شوێنەوارەکەی لە کوردستانی باکووردایە لە
تورکیادایە.

نووح پێغەمبەریش ﷺ درێژەی بە بانگەوازکردندا، کاتێکیش لە سەرەمەرگیدا بوو ئامۆژگاری منداڵەکانی کرد کە تەنها خودا بپەرستن و هاوەڵی بۆ دانەنێن و گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خوای گەورە بکەن، پاشان نووح پێغەمبەر ﷺ کۆچی دوایی کرد.



# چیرۆکی هود پێغەمبەر ﷺ

لە دوای کۆچی دوایی نووح پێغەمبەر ﷺ نەوەکانی بەسەر زەویدا بڵاوبوونەوە و چەندین گەل و تیرە و هۆزی جیاوازیان پێك هێنا، یەکێك لەو هۆزانە ناوی ﴿عاد﴾ بوو کە لە شوێنێکدا دەژیان پێی دەوترا: ﴿ئەحقاف﴾، کە دەکەوتە باکوری ﴿حضرموت﴾ لە نێوان وڵاتی ﴿یەمەن و عومان﴾دا.

ئەمان گەلێك بوون کە گومڕابوو بوون و وازیان لە ئاینی نووح پێغەمبەر ﷺ هێنابوو، هەندێك بتیان بۆ خۆیان دانابوو دەیانپەرست و وازیان لە پەرستنی خودای تاك و تەنها هێنابوو، خەڵکی گەلی ﴿عاد﴾ هەموویان خاوەنی جەستەیەکی بەهێز و باڵای بەرز و چوارشانە بوون و شانازییان بە خۆیانەوە دەکرد و دەیاننازی بە بەهێزی خۆیانەوە.



خوای گەورە هوودی لە خێزان و خانەوادەیەکی باش و بەڕێز هەڵبژارد و وەکو پێغەمبەر ڕەوانەی کرد بۆ ئەوەی گەلەکەی خۆی بانگ بکات بۆ ناسین و پەرستنی خودای گەورەی تاك و تەنها، خەڵکی بێباوەڕیش خۆیان سەرقاڵی ئەوەکرد کە چۆن ڕێگری لەو ئایینە نوێیە بکەن و نەهێڵن بڵاوببێتەوە، چونکە شەیتان گومڕای کردبوون بۆ ئەوەی ئەمان لەسەر بتپەرستی و گومڕایی خۆیان بەردەوام بن.

تیرەی عاد هەر بەردەوامبوون لەسەر دژایەتیکردنی هوود پێغەمبەر ﷺ و گوێڕایەڵییان نەدەکرد، هوود پێغەمبەریش بەردەوام بانگی دەکردن بۆ ڕێگەی ڕاست و خوداپەرستی و بۆ ئاینی خودا ناسین بانگەوازی دەکرد، سەرەڕای بەگوێ نەکردن و دژایەتی گەلەکەی، بەڵام هەر بەردەوامبوو لە بانگەوازکردن تاکو بێنەسەر ڕێگەی ڕاست و باسی هەموو ئەو ناز و نیعمەت و بەخششانەی بۆ دەکردن کە خودای گەورە پێی بەخشیون و پێویستە لەسەر ئەمانیش سوپاسگوزاری خودای گەورە بن و بێئەمەك نەبن بەرامبەری.



تاکو خوای گەورەش نیعمەتی زیاتریان پێببەخشێت. بەڵام ئەوان هەر سووربوون لە سەرپێچیکردنی و بێباوەڕبوون بەرامبەر خودای گەورە، ئەوان گوێڕایەڵی هوود نەبوون و لەسەر بتپەرستی خۆیان بەردەوام بوون، پاشان هوود پێغەمبەریش ﷺ دەیترساندن و باسی بەسەرهاتی گەلەکەی نووحی بۆ دەکردن کە چۆن فەرمانبەرداری خودا نەبوون و خوای گەورە سزای داون، چونکە بێفەرمانی خودایان کردووە، ئەمەش بۆ ئەوەی گەلی عاد بترسن و بگەڕێنەوە بۆ لای خودا.

هوود پێغەمبەر ﷺ بەردەوام گفتوگۆی لەگەڵدا دەکردن بەڵکو باوەڕبهێنن، بەڵام ئەوان لەسەر ئەو بەدڕەفتارییەیان بەردەوام بوون، تەنانەت گاڵتەیان پێدەکرد و قسە و وشەی ناشیرینیان بەرامبەری بەکاردەهێنا و پێیان دەگوت: تۆ شێت بوویت و باوەڕت پێ ناکەین، تۆ دەتەوێت لە ئاینی باووباپیرمان وازبهێنین.



هەندێك لە خەڵكی گەلی عاد نەبێت زۆرینەیان باوەڕیان بە هوود پێغەمبەرﷺ نەکرد و لەسەر بتپەرستی خۆیان بەردەوامبوون، بۆیە هوود پێغەمبەرﷺ لەگەڵ باوەڕدارەکان ئەو ناوچەیەیان بەجێهێشت و خوای گەورە ڕزگاریکردن و بێباوەڕەکانیش بۆ ماوەی حەوت شەو و هەشت ڕۆژی لەسەریەك بای بەهێز و زریانی سەختیان بۆ هات و بێباوەڕەکانی تەفروتووناکرد و هەموویانی لەناوبردن، تەنها هەندێ لە خانوو و شوێنەوارەکانیان مایەوە تاکو خەڵکی و نەوەکانی داهاتوو پەند و ئامۆژگاری لێ وەربگرن و تەنها خودای گەورە بپەرستن، هوود پێغەمبەریشﷺ لەسەر ڕێبازی خوداناسین و خوداپەرستی بەردەوامبوو و بانگەوازی خەڵکی بۆ ئەو ڕێبازە دەکرد، تاکو کۆچی دواییکرد.



# چیرۆکی صالح پێغەمبەر ﷺ

وەکو باسدەکرێت گەلی ﴿ثمود﴾ لە ناوچەیەك ژیاون پێیدەوترێت: ﴿الحجر﴾، کە دەکەوێتە نێوان حیجاز و شام، گەلێکی بەهێز و بەناوبانگ بوون و لە دوای لەناوچوونی گەلی ﴿عاد﴾ هاتوون و زەوییان ئاوەدانکردەوە و باخ و بێستانیان هەبوو و خانووی جوان و قەشەنگ و بەهێزیان لە شاخەکاندا هەڵدەکۆڵی و دروستیان دەکرد، خانووەکانیان هێندە پتەو و بەهێزبوون کە لە دوای لەناوچوونی گەلی ﴿ثمود﴾یش شوێنەوارەکانیان مایەوە. بەڵام گەلی ﴿ثمود﴾ خوای گەورەی تاك و تەنهایان نەدەپەرست و خەریکی بتپەرستنی بوون.

خودای گەورەش صالح پێغەمبەری ﷺ نارد بۆ لایان تاکو بانگەواز بکات بۆ پەرستنی خودای گەورە و ئایینی خودایان پێبگەیەنێت و وازبهێنن لە پەرستنی بتەکان و خراپە و گومڕایی بڵاونەکەنەوە.



خودای گەورە چەندین باخ و باخات و ناز و نیعمەت و بەخششی پێ بەخشیبوون کە لە ژماردن نەدەهاتن، بەڵام ئەوان لەجیاتی ئەوەی سوپاسی خودای گەورە بکەن، ناشکوری و ناسوپاسگوزاری خودای گەورەیان دەکرد.

صاڵح پێغەمبەریش ﷺ ئاگاداری دەکردنەوە و بانگی دەکردن بۆ خوداپەرستی و وازهێنان لە بتپەرستی، داوای لێ دەکردن چاکە بکەن و واز لە خراپەکاری و گومڕایی بهێنن، بۆ ئەمانەش چەندین بەڵگەی لەسەر نیعمەت و بەخششەکانی خودا بۆ دەهێنانەوە.

دوای ئەم بانگەوازەی صاڵح پێغەمبەر ﷺ کەسانی لاواز و هەژاری گەلەکەی بڕوایان پێهێنا، بەڵام کەسانی گەورە و دەستەڵاتداران بڕوایان پێ نەکرد و بەدرۆزنیان دانا و پێیان وت: ئەگەر تۆ پێغەمبەری خودایت موعجیزە و بەڵگەیەکمان پیشان بدە بۆ ئەوەی بڕوات پێ بکەین.

صاڵح پێغەمبەریش ﷺ داوای لە خوای گەورە کرد کە موعجیزەیەکیان بۆ بنێرێت، خودای گەورەش بە صاڵح پێغەمبەری فەرموو: ئەوا موعجیزەیەکیان بۆ دەنێرم کە حوشترێك لەو ناو بەرد و شاخە دێتەدەرەوە.



بەڵام پێیان بڵێ کە هیچ جۆرە خراپەیەك لەو حوشترە نەکەن و زیانی پێ نەگەیەنن، چونکە ئەگەر هەر زیانێك بەو حوشترە بگات، ئەوا چاوەڕوانی سزا و تۆڵەی خودای گەورە بن.

پاشان صالح پێغەمبەر ﷺ پێی وتن: ئاوی ئەو بیرەی هەیانە ڕۆژێك بۆ حوشترەکەیە کە ئاوەکەی دەخواتەوە و ڕۆژەکەی تریش ئاوی بیرەکە بۆ ئەوان بێت، واتە بەنۆرە بێت، هەروەها نابێت هیچ زیانێکیش بە حوشترەکە نەگەیەنن.

پاش ئەوەی ماوەیەك تێپەڕی بێباوەڕەکان فەرمانەکەی صالح پێغەمبەریان ﷺ شکاند و پیلانیان دانا کە حوشترەکە لەناوبەرن و سەریببڕن، کاتێکیان دانا بۆ سەربڕینی حوشترەکە.

بۆیە چەند کەسێکی بێباوەڕ و بەدکار چوون و حوشترەکەیان کوشت و



سەریان بڕی. صاڵح پێغەمبەریش ﷺ لەم کارەیان زۆر تووڕە بوو، بۆیە پێی وتن: ئەوە موعجیزەیەك بوو کە خۆتان داواتان کردبوو، سەرەڕای ئەوەی ئاگادارکرابوونەوە کە ئازاری پێ نەگەیەنن، بەڵام ئێوە فەرمانەکەتان شکاند، بۆیە چاوەڕوانی ئەوە بن کە سزای خودای گەورەتان بۆ بێت، بێباوەڕەکانی ﴿ثمود﴾یش گاڵتەیان پێ کرد و وتیان: دەمانەوێت کاتی سزاکە زووبێت بۆمان. صاڵح پێغەمبەریش ﷺ پێی فەرموون: ئەوا دوای سێ ڕۆژ سزای خوای گەورەتان بۆ دێت، خودای گەورە لە دوای سێ ڕۆژە سزاکەی بۆ ناردن کە گرمە و ناڵەیەکی گەورە لە ئاسمانەوە هات و زەوی لە ژێر پێیان لەرییەوە و بومەلەرزەی سەخت دروست بوو و هەموو بێباوەڕەکانی لەناوبرد، صاڵح پێغەمبەر ﷺ و، باوەڕدارەکانیشی لەو کارەساتە ڕزگارکرد، پاشان صاڵح پێغەمبەر ﷺ دوای ئەو کارەساتە بەردەوام بوو لە بانگەوازکردن بۆ خوداپەرستی تاکو کۆچی دواییکرد.



# چیرۆکی پێغەمبەران ﷺ
# ئیبراهیم و ئیسماعیل ﷺ

حەزرەتی ئیبراهیم ﷺ لە شوێنێکدا لەدایکبوو کە دەکەوێتە وڵاتی عێراقەوە، پاشایەك فەرمانڕەواییکردووە کە زۆر ستەمکاربووە و ناوی ﴿نەمروود﴾ بووە، گەلەکەشی خەریکی بتپەرستی بوون و لە بەرد و دار دروستیانکردووە و پەرستوویانن و وازیان لە پەرستنی خودای تاك و تەنها هێنابوو، ئیبراهیم لەو کاتانەدا لەدایکبوو و تەنانەت باوکی یەکێك بووە لەو کەسانەی کە خەریکی بت پەرستی بووە و بتی دروستکرووە و فرۆشتوویەتی.



کاتێك ئیبراهیم گەورەبوو بیریکردەوە لەوەی کە ئەم بتانە هیچ سوود و زیانێك بە کەس ناگەیەنن، هەمیشەیش بیری لە گەردوون و خۆر و ئەستێرەکان دەکردەوە تاکو بە هۆیانەوە ڕێگەی خوداناسی دۆزییەوە، شەوێکیان کاتێك مانگی بینی بیریکردەوە و وتی وتی: ئەمە خودای منە.. بەڵام بە ڕۆژمانگ دیارنەما و ونبوو، بۆیە وتی نابێت خودا ون ببێت.

پاشان وتی: خۆر خودای منە چونکە لە مانگ گەورەترە و ڕووناکتریشە، دیارە ئەویش بە شەو ون دەبێت و دیارنامێنێت، بۆیە ئەمجارەیش وتی: نابێت خودای من ئاگای لە من نەمێنێت.. پاش ئەوەی کە هەر بیریدەکردەوە بە هۆی ئەوانەوە ڕێگەی خودا ناسی دۆزییەوە.

دوای ناسینی خودای گەورە هەوڵیدا بە شێوەیەکی زۆر جوان باوکی ئاگادار بکاتەوە لەوەی کە وازبهێنێت لەو بتانەی کە هیچ سوود و زیانێکیان نییە و تەنانەت ناتوانن پارێزگاری لە خۆشیان بکەن، پاشان گەلەکەیشی ئاگادارکردەوە.



بەڵام ئەوان مکوڕبوون لەسەر گومڕایی و بێباوەڕی خۆیان، ئیبراهیمیش ﷺ ویستی بەڵگەیەکیان پیشان بدات و هەموویان فێری ئەوە بکات کە ئەو بتانە بێدەسەڵاتن. بۆیە چاوەڕێی کرد، تاکو ئەوەی جەژنێکیان هەبوو کاتەکەی هات و خەڵکی هەموویان چوونە دەرەوەی شار، ئیبراهیمیش بیانوویەکی هێنایەوە و لەگەڵیاندا نەچوو.

کاتێك شارەکە کەسی تێدا نەمایەوە ئیبراهیم تەورێکی هەڵگرت و چووە ناو ئەو شوێنەی بتەکانی تێدابوو، بە تەورەکەی هەموو بتەکانی تێکشکاند، تەنها بتە گەورەکەیان نەبێت، کاتێك تەواوبوو تەورەکەی خستە ملی بتە گەورەکە و ئەو شوێنەی بەجێهێشت.



کاتێك خەڵکەکە گەڕانەوە بینییان هەموو بتەکانیان تێکشکاوە تەنها بتە گەورەکەیان نەبێت، تەورێکیش بە ملی بتە گەورەکەوە هەڵواسراوە، بۆیە کەوتنە مقۆمقۆکردن تاکو بزانن چی ڕوویداوە. پاشان وتیان ڕەنگە ئەوە کاری ئەو گەنجە بێت کە ناوی ﴿ئیبراهیم﴾ە، بڕۆن بانگی بکەن.

کاتێك ئیبراهیم هات وتیان: ئەوە بۆ ئەو کارەت کردووە؟ ئەویش وتی: ئەوەتانێ تەورەکە لای بتە گەورەکەیە دیارە ئەو ئەو کارەی کردووە, ئەوانیش وتیان: خۆ ئەو بتە هیچ دەسەڵاتێکی نییە و ناتوانێت هیچ کارێك بکات، باشە چۆن دەتوانێت ئەو کارە ئەنجام بدات؟

ئیبراهیمیش ﷺ، وتی: باشە کە ئەو بتانە هیچ دەسەڵاتێکیان نییە و ناتوانن زیان لە خۆیان دووربخەنەوە، چۆن دەتوانن پارێزگاری لە ئێوە بکەن؟ باشە ئێوە چۆن ئەو بتانە دەپەرستن؟

فەرمانڕەواکەش و خەڵکەکەش تووڕەبوون کە ئیبراهیم بەوشێوەیە باسی بتەکانیان دەکات ﴿لە کاتێکدا دەشیانزانی کە بتەکان هیچیان پێناکرێت﴾، بۆیە بڕیاریاندا کە ئاگرێکی گەورە بکەنەوە و ئیبراهیم بخەنە ناو ئەو ئاگرەوە.



بۆیە ئەو کارەیان کرد و ئیبراهیمیان هەڵدایە ناو ئاگرەکەوە، بەڵام خوای گەورە پاراستی و بە بێ هیچ زیانێك ڕزگاری بوو، پاشان ئیبراهیم پێغەمبەر ﷺ وڵاتی عێراقی بەجێهێشت و ڕوویکردە وڵاتی شام، تاکو هەندێ کەس ببنە شوێنکەوتەی و بڕوای پێ بکەن.

ئیبراهیم پێغەمبەر ﷺ خێزانێکی هەبوو ناوی ﴿سارە﴾ خاتوون بوو، بەڵام هیچ منداڵیان نەبوو، پاشان ئیبراهیم پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ خێزانەکەی کۆچیکرد بەرەو وڵاتی ﴿میصر﴾، لەوێ ﴿هاجەرە﴾ خاتوونی مارەکرد و خوای گەورە لە ﴿هاجەرە﴾ خاتوون کوڕێکی پێبەخشی و ناوی لێنا: ﴿ئیسماعیل﴾.

خوای گەورە فەرمانی بە ئیبراهیم ﷺ کرد کە هاجەرە خاتوون و ئیسماعیلی کوڕی ببات بۆ مەککە دایان بنێت و لەوێ بەجێیان بهێڵێت، کە ئەو کات مەککە شوێنێکی وشك و برنگ و بێ ئاو و سەوزایی بوو و دوور بوو لە ئاوەدانی، واتە هیچ پێداویستی و شتێکی بۆ ژیان تێدا نەبوو، ئیبراهیم پێغەمبەر ﷺ گەڕایەوە و هاجەرە خاتوون و ئیسماعیلی کوڕی کە شیرەخۆرەبوو لە مەککە بەجێیهێشتن.



هاجەرە خاتوون و کوڕەکەیشی ئەو خواردنە کەمەی پێیان بوو خورا و تەواو بوو، ئیسماعیلی منداڵیش کە برسی و تینووی بوو دەستی بە گریانێکی زۆر کرد، هاجەرە خاتوونیش لە بەر کوڕەکەی نەیدەزانی چیبکات و چۆن خواردن پەیدا بکات، بۆیە لە حەسرەتی ئەو لە نێوان دوو تەپۆڵکە و گردددا ڕایدەکرد بۆ دانەیەکیان و دەگەڕایەوە بۆ ئەوەکەی تریان و هەر ئەمبەرەو ئەوبەری دەکرد.

کە ئەو گردانە دانەیەکیان ناوی ﴿صەفا﴾ بوو و ئەوەکەی تریشیان ناوی ﴿مەروە﴾ بوو، ﴿هەر لە شوێنپێی ڕاکردنی ئەو ئافرەتەیە کە ئەو کەسانەی دەچن بۆ حەجکردن دەبێت لە نێوان ئەو دوو شوێنەدا چەند جارێك هاتوچۆ بکەن و شوێن پێی ئەو ئافرەتە هەڵبگرن﴾، دوای ئەو چەندجار ڕاکردنەی، خوای گەورە فریشتەیەکی نارد و لای قاچی ئیسماعیلەوە کانییەکی هەڵقووڵاند کە ناوی ﴿زەمزەم﴾ە، هاجەرەش کە گەڕایەوە بۆ لای منداڵەکەی خێرا منداڵەکەی تێر ئاو کرد و خۆیشی لە ئاوەکەی خواردەوە و زۆر دڵخۆش بوو بەوەی کە منداڵەکەی لەدەست نەدا و هیچی لێ نەهات.



ئیبراهیم پێغەمبەریش ﷺ جار نا جارێك سەردانی دەكردن، پاش ئەوەی كە ئیسماعیل گەورەبوو، خوای گەورە بە خەونێك ئیبراهیمی ئاگادارکردەوە كە دەبێت ئیسماعیلی کوڕی سەرببڕێت، ئەویش ئەو خەونەی بۆ کوڕەکەی گێڕایەوە و ئیسماعیلیش بەبێ وەستان و دوودڵی بە باوكی وت: باوکە گیان فەرمانەکەی خودای گەورە جێبەجێ بکە، کاتێك ئیبراهیم ﷺ ویستی کارەکەی جێبەجێ بکات، هەر لەو کاتەدا خوای گەورە بەرانێکی بۆ ئیبراهیم پێغەمبەر ﷺ نارد و پێی فەرموو کە خودای گەورە ویستوویەتی تاقییان بکاتەوە و ئەوانیش لە تاقیکردنەوەکەدا سەرکەوتوو بوون، بۆیە پێویست ناکات ئیسماعیل سەرببڕێت، ئەو بەرانە سەربڕە و بیکە بە قوربانی.



پاش ئەوەش خودای گەورە فەرمانی بە ئیبراهیم کرد کە بچێت و لە شوێنێکی دیاریکراودا ماڵێك بۆ خوای گەورە ﴿کەعبەی پیرۆز﴾ بنیات بنێت، ئەوانیش لەو شوێنەدا بە ئەرك و زەحمەتکێشان و ماندووبوونی بێوچان خەریك بوون و ﴿کەعبەی پیرۆز﴾یان بنیاتنا و تەواوبوون لە دروستکردنی، پاشان ئیبراهیم پێغەمبەر ﷺ بە ئیسماعیلی فەرموو کە بچێت بەردێکی بۆ بهێنێت کە لە ڕەنگ و شێوە و لە هەموو شتێکدا لە بەردەکانی تر جیاوازبێت، بۆ ئەوەی خەڵکی بێن و تەواف بکەن و بە دەوریدا بسوڕێنەوە، ئەویش ڕۆیشت بگەڕێت، زۆر گەڕا بەڵام هیچی دەستنەکەوت. کاتێك گەڕایەوە بۆ لای باوکی بینی بەردێکی لە لایە کە ﴿بەردە ڕەشەکەیە﴾ و لە هەموو بەردەکانی تر جیاوازترە و لە هیچیان ناچێت، بە سەرسوڕمانەوە لێی پرسی: باوکەگیان کێ ئەو بەردەی بۆ هێنایت؟ ئەویش فەرمووی: ئەوە جوبرەئیلی فریشتە بۆی هێناوم. پاشان بەردە ڕەشەکەیان لە شوێنێکی کەعبەوە دانا.



لەکاتی تەواوکردنی کەعبەی پیرۆزدا هەردووکیان نزا و دوعایان کرد و پاڕانەوە کە لە وەچە و نەوەی داهاتوویان گەلێکی موسوڵمان بخاتەوە کە خەریکی پەرستنی خودای تاك و تەنها بن، پاڕانەوە کە خوای گەورە بە میهر و سۆز و بەزەیی خۆی لێیان خۆشبێت و لە پاش ئەمان پێغەمبەرێکی ڕاستگۆ ڕەوانە بکات کە ببێتە پێشەوای خەڵکی و مەککەش بکاتە شوێنێکی هێمن و ئارام و ئاساییش، خودای گەورەش نزا و پاڕانەوەکانیانی قبوڵکرد و لە دوای تێپەڕینی چەندین ساڵ خودای گەورە لە وەچە و نەوەکانی ئەواندا پێغەمبەری خۆشەویستمان ﴿محەمەدﷺی کوڕی عەبدوڵلای﴾ ڕەوانەکرد. هەروەها لەو کاتەوە تاکو ئێستاش بە بەردەوامی خەڵکیش سەردانی مەککە دەکەن و دەچن بۆ جێبەجێکردنی ئەرکێکی ئایینی سەرشانیان، ئەویش: ﴿حەجکردنە﴾.

پاشان خوای گەورە کوڕێکی تریشی بە ئیبراهیم پێغەمبەرﷺ بەخشی و ناوی لێنا: ﴿ئیسحاق﴾. خودای گەورەش ئیسماعیل و ئیسحاقیشی کردە پێغەمبەر.

هەروەها ئیبراهیم پێغەمبەرﷺ بە باوکی پێغەمبەران ناسراوە و هەر ئەویش یەکەم کەس بووە کە لەو سەردەمەوە ئێمەی بە ﴿موسوڵمان﴾ ناوبردووە.



# چیرۆکی یوسف پێغەمبەر ﷺ

هەروەك لە ژیانی ئیبراهیم پێغەمبەردا ﷺ باسمان کرد، خوای گەورە لە ﴿سارە﴾ خاتوون کوڕێکی بە ئیبراهیم پێغەمبەر بەخشی ناوی ﴿ئیسحاق﴾ بوو کە ئەویش یەکێك بوو لە پێغەمبەرەکانی خودا ﷺ، خوای گەورە کوڕێکیشی بە ئیسحاق پێغەمبەر بەخشی ناوی ﴿یەعقوب﴾بوو کە ئەمیش پێغەمبەری خودا بوو ﷺ.

خودای گەورە دوازدە کوڕی بە یەعقوب پێغەمبەر ﷺ بەخشی کە دوانیان بچووك بوون ناویان ﴿یوسف﴾ و ﴿بنیامین﴾ بوو ئەم دوانەیان دایکیان جیاواز بوو لە براکانی تریان، باوکیان ئەم دوانەی کۆتاییی و بە تایبەتی ﴿یوسف﴾ی زۆر خۆشدەویست، یوسف خەونێکی بینی و بۆ باوکی گێڕایەوە و وتی: لە خەونمدا ڕۆژ و مانگ و یازدە ئەستێرەم بینی کڕنووشیان بۆ دەبردم.



باوکیشی وتی: کوڕی خۆم ئەم خەونە بۆ هیچ کەس و تەنانەت بۆ براکانیشتی نەگێڕیتەوە، چونکە یەعقوب پێغەمبەر ﷺ یوسفی زۆر خۆشدەویست دەترسا براکانی شتێکی بەسەربهێنن، براکانی یوسفیش هەستیان بەوە کردبوو کە باوکیان یوسفی لە هەموویان خۆشتر دەوێت، بۆیە هەوڵیاندا بە هەر شێوەیەك بێت یوسف لە باوکیان دابڕن، چونکە وا بیریان دەکردەوە کە ئەگەر یوسف لەبەرچاوی باوکیان نەمێنێت، ئەوا باوکیان ئەمانی خۆشدەوێت و یوسفی لەبیر دەچێتەوە، بۆیە لەناو خۆیاندا پیلانێکیان دارشت و ڕۆژێکیان چوون بۆ لای باوکیان و پێیان وت: باوکە دەمانەوێت هەموومان بچین بۆ دەشت و دەر و سەیران و یاری بکەین، ڕێگەمان بدە یوسفیش لەگەڵ خۆماندا ببەین، دڵنیابە ئاگاداری یوسف دەبین و نایەڵین هیچی لێ بەسەربێت.



باوکیشیان گومانی لێیان هەبوو و پێی وتن: دەترسم ئێوە یاری بکەن و ئاگاداری یوسف نەبن و گورگ بیخوات؟ ئەوانیش سوێندیان بۆ باوکیان خوارد لەسەر ئەوەی کە ناهێڵن کارەساتی وەها ڕووبدات و هەر ناخۆشییەکیش ڕوویدا ئەوا دەبێتە مایەی عەیبە و شەرمەزاری بۆ ئەمان، بۆیە زۆر سووربوون لەسەر ئەوەی کە یوسفیش لەگەڵ خۆیاندا ببەن، دواتر بە هەرشێوەیەك بوو باوکیان ڕێگەی پێدان کە یوسف لەگەڵ خۆیاندا ببەن، ئەوانیش خۆیان ئامادەکرد و لەسەر پیلانەکەی خۆیان کەوتنەڕێ و ڕۆیشتن بۆ شوێنێکی دوور، لەوێ ویستیان یوسف لەناوبەرن، بەڵام یەکێك لە براکانی وتی: با ڕاستەوخۆ لەناوی نەبەین، بەڵکو فڕێی دەدەینە ناو بیرێکەوە، بۆیە بەگوێی ئەویان کرد و یوسفیان گرت و فڕێیاندایە ناو بیرێکەوە، بۆ ئەوەی ئەگەر لە بیرەکەش هاتە دەرەوە ئەوا نەزانێت بگەڕێتەوە بۆ ناوچەکەی خۆیان.



بۆیە دوای ئەنجامدانی کارەکەیان، لە سەر لە ئێوارەی ئەو ڕۆژەدا بە خەمباری و دڵتەنگییەوە گەڕانەوە بۆ لای باوکیان، کراسەکەی یوسف پیشانی باوکیان دەدەن کە بە خوێن ڕەنگیان کردبوو و وتیان: باوکە گیان ئێمە سەرگەرمی یاریکردن و ڕاکردن و تیرئەندازی بووین و یوسفمان لای شتومەکەکان دانابوو، تاکو ئاگاداریان بێت، بەڵام کاتێك گەڕاینەوە گورگ خواردبووی و ئێمەش لێی دووربووین، پاشان کراسەکەی یوسفیان پیشانی باوکیان دا، باوکیشیان کە کراسەکەی یوسفی بینی درۆکەی ئەوانی بۆ دەرکەوت، چونکە ئەو خوێنەی بەسەر کراسەکەوە بوو هی کوڕەکەی نەبوو و کراسەکەش نەدڕابوو ﴿دیارە ئەگەر گورگ بیخواردایە ئەوا کراسەکەی دەدڕا﴾، پاشان وتی: دیارە دەروونتان کارێکی ترسناکی پێکردوون، منیش بە شێوەیەکی ڕێکوپێك ئارامدەگرم و تەنها داوای یارمەتی لە خودای گەورە دەکەم.



کاتێك یوسف لەناو بیرەکەدا بوو، کاروانێك لەو نزیکانە مۆڵیاندا تاکو پشوویەك بدەن، یەکێك لە کەسەکانی ناو کاروانەکە چوو ئاو لە بیرەکە دەربهێنێت، کاتێك دۆڵچەی ئاوەکەی شۆڕکردەوە بۆ ناو بیرەکە یوسف خۆی بە دۆڵچەکەدا هەڵواسی و لە بیرەکە هاتە دەرەوە، ئەو کەسەش یوسفی بینی و زۆر دڵخۆشبوو بە بینینی ئەم کوڕە منداڵە و چوو بۆ لای هاوڕێکانی تاکو ئەو هەواڵە خۆشەیان پێ بڵێت کە منداڵێکی دۆزیوەتەوە و دەتوانن لەگەڵ خۆیاندا بیبەن و بیفرۆشن بە کەسێك و هەندێك پارەیان دەستبکەوێت، بۆیە بەپەلە شاردیانەوە نەوەکو کەس و کاری بێن و بۆی بگەڕێن و وەریبگرنەوە، بۆیە خێرا دەستیان بە ڕۆیشتن کردەوە و ناوچەکەیان بەجێهێشت.

کاروانەکە چوو بۆ وڵاتی میصر و لەوێ لە بازاڕی کۆیلە و بەندەفرۆشەکان بە چەند درهەمێکی کەم دەیفرۆشن بە عەزیزی میصر و لەکۆڵی خۆیانی دەکەنەوە.



عەزیزی میصریش یوسفی وەکو بەندەیەك کڕیبوو تاکو وەکو دیارییەك پێشکەشی خێزانەکەی بکات.

یوسفیش گەورە بوو و خاوەنی ڕەوشت و ڕەفتارێکی زۆر بەرز بوو، خێزانەکەی عەزیزی میصریش زۆر پێی سەرسام بوو و دووچاری ئەوینی بوو، بەڵام یوسف گوێی پێ نەدا و خۆی گرت و خودای گەورە پاراستی، بۆیە ژنەکەی عەزیزی میصر زۆرتووڕە بوو و یوسفی خستە زیندان و زیندانیکرد.

لە زیندانەکەشدا کۆمەڵێك کەسی لێبوو، یوسف لەوێش زۆر بە جوانی ڕەوشت و ڕەفتارێکی زۆر بەرز مامەڵەی دەکرد و بۆیە جارێکیان دوو



کەسیان خەونیان بینی، چونکە یوسفیش کەسێك بوو ڕەفتار و مامەڵەی جوان بوو، بۆیە هاتن بۆ لای و خەونەکەی خۆیان بۆ گێڕایەوە، ئەویش لێکدانەوەی بۆ خەونەکانیان کرد و بە یەکێکیانی وت: دەکرێیت بە داردا و دەکوژرێیت. بەوەی تریشیانی وت: تۆش ئازاد دەکرێیت. هەردوو خەونەکەش وەکو خۆیان هاتنەدی، ئەو کەسەی کە ئازاد کرا لای پاشای میصر خزمەتکاری دەکرد، بۆیە شەوێکیان پاشای وڵاتی میصر خەونێکی بینی، چەند جارێکیش ئەو خەونەی دووبارە دەبوونەوە، بە هەموو وەزیر و کەسانی دەوروبەر و بەردەستی نەیانتوانی لێکدانەوەی خەونەکەی بکەن، بۆیە ئەو کەسەی کە یوسف لە زینداندا لێکدانەوەی بۆ خەونەکەی کردبوو، بیری کەوتەوە کە کەسێك هەیە لە زینداندا و لێکدانەوە بۆ خەون دەکات، ئەویش پادشای ئاگادارکردەوە کە کەسێك لە زینداندایە دەتوانێت لێکدانەوە بۆ خەونەکەی بکات، پادشایش فەرمانیکرد ئەو کەسە بهێنن.



بەردەستەکانیشی یوسفیان هێنا و لێکدانەوەی بۆ خەونەکەی کرد. دوای ئەوەیش پادشا یوسفی لە زیندان ئازادکرد و سەرسام بوو بە هەڵسوکەوت و بۆچوونەکانی یوسف، بۆیە بڕیاریدا بیکاتە وەزیری گەنجینەی میصر، یوسفی پێغەمبەریش ﷺ دەستی کرد بە بڵاوکردنەوەی ئایین و بڵاوکردنەوەی دادپەروەری، پاش ماوەیەك خەونەکەی پادشا هاتەدی و گرانی و قاتوقڕی لە میصردا بڵاوبووەوە و هەموو ناوچەکەی گرتەوە، دادپەروەری یوسفیش لە میصر و لە ناوچەکانی دەرەوەی میصردا بڵاوبووەوە، بۆیە هەموو خەڵکانی ناوچەکان دەهاتن بۆ لای یوسف تاکو یارمەتییان بدات و براکانیشی هاتن بۆ لای یوسف تاکو هەندێ خواردن و خواردەمەنی وەربگرن، یوسف براکانی خۆی ناسییەوە بەڵام ئەوان یوسفیان نەناسییەوە، کاتێك براکانی ویستیان بگەڕێنەوە یوسف پێی وتن هەرکاتێك هاتنەوە دەبێت «بنیامین»ی براشتان لەگەڵ خۆتان بهێنن تاکو خواردنی زیاترتان پێبدەم، ئەوانیش گەڕانەوە و هەواڵەکەیان بە باوکیان وت.



یەعقوب پێغەمبەریش ﷺ هەرچۆنێك بوو ﴿بنیامین﴾ی لەگەڵ ناردن، پاش ئەوەی جارێکی تر هاتنەوە یوسف پێغەمبەر ﷺ بە هەر ڕێگەیەك بوو بنیامینی برای لای خۆی هێشتەوە، پاشان براکانی ڕۆشتنەوە و بە باوکیان وت: بنیامینی برامان لە وڵاتی میصرە و عەزیزی میصر لای خۆی گلی داوەتەوە، باوکیشی خەم و خەفەتەکەی یوسفی بۆ تازە بووەوە و ئەوەندە گریا تاکو بینایی چاوەکانی لە دەستدا، بۆیە براکانی بۆ جارێکی تر بۆ پێداویستی و خواردن گەڕانەوە بۆ لای یوسف پێغەمبەر ﷺ ئەویش خۆی پێناساندن و لێیان خۆشبوو و کراسەکەیشی بە براکانیدا نارد بۆ لای باوکی کە بە هۆی زۆرگریان و خەفەتیەوە بۆ یوسفی کوڕی چاوەکانی لەدەست دابوو و کوێربووبوو، باوکیشی کراسەکەی هێنا بە سەر چاویدا و چاوەکانی چاکبوونەوە. پاشان یەعقوب ﷺ لەگەڵ خێزانی و کوڕەکانیدا ڕۆیشتن بۆ لای یوسف پێغەمبەر ﷺ بۆ میصر تاکو لەوێ نیشتەجێ ببن.



کاتێک چوونە ژوورەوە بۆ لای یوسف پێغەمبەر ﷺ، باوکی و دایکی و هەموو براکانی کڕنووشی ڕێزیان بۆ یوسف برد، یوسفیش ﷺ بە باوکی وت: ﴿باوکە ئەمە خەونەکەمە کە زوو دیم، وا خودای گەورە بە ڕاستی گێڕا و هێنایەدی﴾. هەروەها خودا چاکەی لەگەڵ کردم کە لە بەندیخانە دەریهێنام و ئێوەی لە دەشتەوە هێنا بۆ لام، پاش ئەوەی کە شەیتان نێوانی من و براکانمی تێکدا. بێگومان خودای من هەرشتێک کە مەیلی لێبێت جوان ڕێکی دەخات. ﴿بە ڕاستی خودا زانایە و کارەکانی پڕ حیکمەتن﴾.

پاشان یوسف پێغەمبەر ﷺ پاڕایەوە و ڕووی سوپاسگوزاری کردە خودای گەورە و سوپاسی خودای گەورەی کرد کە ئەو هەموو زانست و دەسەڵات و ناز و نیعمەتەی پێبەخشیوە.



# چیرۆکی ئەیوب پێغەمبەر ﷺ

ئەیـوب پێغەمبـەر ﷺ لـە نـەوەی ئیسـحاق پێغەمبـەری کـوڕی ئیبراهیـم پێغەمبـەرە و ﷺ ، لـە خاکـی (بثینـە)ی ناوچـەی (حـوران) ژیاوە و کەسێکی دینـدار و چاکەخـواز بـووە و زۆر بـە باشـی خـوای گەورەی ناسیوە، بـە ڕەحم و بەسۆزبووە و خەمخۆر و یارمەتیدەری هەژار و نەدار و لێقەوماوان بـووە، زۆر ڕێزی لـە میوان گرتـووە، هەروەها بانگی گەلەکەیشی دەکرد بۆ پەرستنی خودای تاك و تەنها، هەروەها خاوەنی ماڵ و سامانێکی زۆربـووە لـە هەمەچەشنەی ناز و نیعمەت و زەوی و زاری فراوان و مەڕوماڵاتـی زۆری هەبـووە.



جگە لەمەیش خاوەنی منداڵ و کەس و کار و بنەماڵەیەکی گەورە بووە.
لەناکاودا خوای گەورە تووشی تاقیکردنەوەیەکی قورسی دەکات و هەموو ئەو ماڵ و سامان و ناز و نیعمەت و کوڕ و کەس و کارەکەی لێدەسەندرێتەوە و هەموویان لە ناوچوون تەنها ژنەکەی نەبێت، هەروەها تووشی چەندین دەرد و نەخۆشی و ناخۆشی دەبێت و هەموو ئەندامەکانی جەستەی تووشی نەخۆشی دەبێت جگە لە دڵ و زمانی کە یاد و زیکری خودای گەورەی پێدەکات، بێگومان ئەویش لەسەر ئەو هەموو بەڵا و نەخۆشی و نەهامەتییانە هەر سوپاسی خودا دەکات و زۆر بە باشی ئارامدەگرێت و خۆڕاگر دەبێت و بە بەشی خودا ڕازی دەبێت.



هەژاری و نەخۆشییەکەی بە جۆرێك پەرەیسەندبوو کە خەڵکی لێی تەکینەوە و هەمووان لێی دوورکەوتنەوە، تەنها ژنەکەی نەبێت کە بەردەوام خزمەت و چاودێری دەکرد و بە بەردەوامی یارمەتی دەدا و هاوکاری مێردەکەی دەکرد و هەموو چاکە و وەفایەکی ژیانی پێشووی مێردەکەی لەیادنەکردبوو.

تاکو دەهات نەخۆشییەکەی ئەیوب پێغەمبەر ﷺ قورستر دەبوو، ئەویش بەردەوام بوو لەسەر خۆڕاگری و ئارامگرتن، ئەو ئارامگرتنەشی سوودێکی زۆری بۆ هەبوو، هەم لای خوای گەورە پاداشتێکی زۆری بۆ دانا و هەم بووە هۆی ئەوەی خوای گەورە شیفای خێری بۆ نارد و لە نەخۆشییەکەی چاك بووەوە، ئەویش بەوەی خوای گەورە پێی فەرموو قاچت بدە بە زەویدا و کانییەك هەڵدەقووڵێت و لە ئاوی کانییەکە بخۆرەوە، پاشان بە ئاوەکە خۆت بشۆ.



ئەویش فەرمانەکەی جێبەجێکرد و لەو شوێنەدا کانییەك هەڵقووڵا و ئەویش لە ئاوی کانییەکەی خواردەوە و دواتر خۆی بە ئاوی کانییەکە شۆرد، خوای گەورەش شیفای بۆ نارد و لە نەخۆشییەکەی چاکبووەوە.

هەروەها خوای گەورە لەگەڵ ئەوەشدا کە لە نەخۆشییەکەی چاکی کردەوە، ماڵ و سامانێکی زۆری پێبەخشییەوە و دەوڵەمەندی کرد، ئەیوب پێغەمبەریش زۆر زیاتر سوپاسی خوای گەورەی کرد و زۆر سوپاسگوزاری بۆ خوای گەورە دەردەبڕی و موسوڵمانانیش بڕوایان بە خوای گەورە پتەوتر بوو و بۆیان دەرکەوت کە خۆڕاگری و ئارامگرتن ڕێگای پیاوچاکان و بەندە چاکەکان و بەندە سوپاسگوزارەکانە.



# چیرۆکی مووسا پێغەمبەر (د.خ)

لە دوای ئەوەی کە یەعقوب پێغەمبەر (د.خ) لەگەڵ یوسفی کوڕی و کوڕ و نەوەکانی دیکەیدا لە میصر نیشتەجێ بوون، ئیتر بە بەنوئیسرائیل ناویان دەرکرد، دوای تێپەڕینی ماوەیەکی زۆر و هاتنی چەند نەوەیەکی نوێ بەدوایاندا، پاشایەك دروست بوو بە ناوی فیرعەونەوە، کە زۆر ستەمکاربوو.

جارێك فیرعەون خەونێك دەبینێت، ئەویش خەونەکەی بۆ بەردەستەکانی دەگێڕێتەوە، ئەوانیش لێکدانەوەی ئەوەی بۆ دەکەن کە منداڵێکی کوڕ لەدایکدەبێت؛ کە دەبێتە هۆی ئەوەی کۆتایی بە دەسەڵاتی فیرعەون دەهێنێت، فیرعەونیش بڕیارێك دەدات کە هەر منداڵێك لەدایکبوو سەری ببڕن و لەناوی ببەن، دوای ماوەیەك مووسا لەدایك دەبێت، دایکیشی لە ترسی فیرعەون و کاربەدەست و پاسەوانەکانی دەیشارێتەوە، بۆیە دەیخاتە ناو سندووقێکەوە و دەیخاتە ناو ناوی نیلەوە.





پاشان دایکی مووسا بە کچەکەی خۆی ﴿واتە خوشکەکەی مووسا﴾ دەڵێت: لەدوورەوە چاودێری بکات بزانێت بەرەو کوێوە دەڕوات، ئاوەکەش سندووقەکە بەرەو لای پاسەوانەکانی کۆشکی فیرعەون دەبات، پاسەوانەکانیش سندووقەکە دەکەنەوە و سەیر دەکەن منداڵێکی کوڕی تێدایە، بۆیە دەیبەن بۆ لای خێزانی فیرعەون کە ناوی ﴿خاتوو ئاسیە﴾یە، ئەویش ئەو منداڵەی خۆشدەوێت و بە فیرعەون دەڵێت: با نەیکوژین و لەناوی نەبەین، بەڵکو سوودی بۆمان هەبێت و بیکەینە کوڕی خۆشمان، فیرعەونیش ڕازیبوو و لەناو کۆشکدا هێشتییەوە.

پاشان ئەم منداڵەش پێویستی بەوە دەبێت کە دایەنێکی هەبێت تاکو شیری پێبدات و بەخێوی بکات، هەر دایەنێکیان بۆ دەهێنا ئەم منداڵە شیری مەمکەکانی هیچ کەسێکی نەدەخوارد، خوشکەکەیشی چوو بۆ لایان و پێی وتن: من ئافرەتێك دەناسم، بەڵکو ببێتە دایەنی ئەو منداڵە.

ئەوانیش ڕازیبوون و ئافرەتەکەش هات بۆ لای مووسا و شیری خۆی پێدا و ئەویش شیری ئەو دایەنەی خوارد ﴿دیارە کە ئەو ئافرەتە دایکی مووسا خۆی بوو﴾.

پاشان مووسا لەناو کۆشکدا گەورە بوو و بوو بە لاوێکی پێگەیشتوو، ڕۆژێك مووسا دەچێت بۆ بازاڕ لەوێ دوو کەس دەبینێت کە شەڕیانە، یەکێکیان میصرییە و لە گەلەکەی فیرعەونە، ئەوەی تریش بەنو ئیسرائیلییە، کابرای بەنو ئیسرائیلییەکە ڕوودەکاتە مووسا کە یارمەتی بدات و لە دەستی ئەو پیاوە ڕزگاری بکات، لەوکاتەدا مووساش سیخورمەیەك یان زللەیەك دەکێشێت بە کابرای میصریدا و کابراکەش دەکەوێت و گیان لەدەست دەدات، دوای ئەوە مووسا زۆر پەشیمان دەبێتەوە و دەڵێت: خودایە لێم خۆشبە، ئەوە کردەوەیەك بوو لە شەیتانەوە و مەبەستی کوشتنیم نەبوو، بۆ ڕۆژی دواتر هەواڵەکە بڵاوبووەوە کە کەسێکی میصری لە گەلەکەی فیرعەون بە دەستی مووسا کوژراوە.



بۆیە میصرییەکان لێی کۆبوونەوە کە بچن تۆڵەی خۆیانی لێبکەنەوە، پیاوێکی دڵسۆزیش بە ڕاکردن ڕۆیشت و بە مووسای وت: خێرا برۆ و وڵاتی میصر بەجێبهێڵە، خەڵکی کۆبوونەتەوە و دەیانەوێت لەناوت ببەن، مووساش ڕۆیشت و میصری بەجێهێشت و چوو بۆ خاکی مەدیەن لە نزیکی شام، لەوێ لای کانییەکەوە بینی کە قەرەباڵغییە و خەڵکی کۆبوونەتەوە خەریکن ئاژەڵ ئاو دەدەن، لەولاتریشەوە دوو کچیش وەستاون، وتی: ئەوە چیتانە بۆ ئێوەش ناچن ئاژەڵەکان ئاو بدەن؟ وتیان: ئێمە باوکێکی پیرمان هەیە بۆیە ئەو نەیتوانیوە و ئێمە هاتووین ئەو ئاژەڵانە ئاو دەدەین، با چۆڵ ببێت ئەوکاتە ئاویان بدەین. مووساش یارمەتیدان و ئاژەڵەکانی بۆ ئاودان، پاشان ڕۆیشتە بن دارێك دانیشت بۆ ئەوەی پشوویەك بدات.



کچەکانیش کە چوونەوە بۆ ماڵەوە ئەو بەسەرهاتەیان بۆ باوکیان گێڕایەوە کە باوکیان یەکێك بوو لە پیاوچاکەکان، وتیان: کەسێك بوو یارمەتیداین کە باش و ڕێکوپێك و بەهێزیش بوو، ئەویش یەکێك لە کچەکانی نارد بەدوای مووسادا، مووساش بەسەرهاتی خۆی بۆ گێڕایەوە، پاشان پیاوچاکەکە پێی وت: مەترسە تۆ لە دەست ستەمکاران ڕزگارت بووە. پاشان بە مووسای وت: ئەگەر بۆ ماوەی دە ساڵ شوانیم بۆ بکەیت ئەوا یەکێك لە کچەکانمت لێ مارە دەکەم، بۆیە هەردووکیان لەسەر بابەتەکە ڕێککەوتن.

دوای تەواوبوونی ئەو ماوەیەش مووسا بڕیاریدا بگەڕێتەوە بۆ وڵاتی میصر، لەگەڕانەوەیدا لە کێوی ﴿طوور﴾ لە سینا مووسا لە دوورەوە ئاگرێکی بینی و بە خێزانەکەی وت: من دەچم بۆ لای ئەو ئاگرە تاکو ئەگەر خەڵکی لێبێت بۆ ڕێگەی گەڕانەوەمان پرسیاریان لێبکەم، بۆیە ڕۆیشت بۆ لای ئاگرەکە.



لەوکاتەدا پەروەردگار بانگی لێکرد و فەرمووی: من پەروەردگاری تۆم و تۆم کردووە بە پێغەمبەر، بچۆ بۆ لای فیرعەون بۆ ئەوەی پەیام و بانگەوازی ئایینی خودای پێبگەیەنیت، چونکە ئەو لە ستەم و زۆرداریدا زیادەڕۆیی کردووە، بۆ ئەم کارەیش خودای گەورە هەندێ موعجیزەی بە مووسا پێغەمبەر ﷺ بەخشی و هاروونی برایشی لەگەڵدا ڕەوانەکرد و فەرمووی: بە نەرم و نیانی لەگەڵ فیرعەوندا گفتوگۆ بکەن.

بۆیە مووسا پێغەمبەریش ﷺ گەڕایەوە بۆ لای خێزانەکەی و چوونەوە بۆ وڵاتی میصر و لەگەڵ هاروونی برایدا چوون بۆ لای فیرعەون تاکو پەیامی خودای پێبگەیەنن، هەردووکیان پێیان وت: هاتووین پەیامی خودای گەورەت پێبگەیەنین کە تەنها ﴿الله﴾ بپەرستیت و هاوەڵ و هاوبەشی بۆ دانەنێیت، بەڵام فیرعەون بە مووسا پێغەمبەری وت: ئەگەر تۆ پێغەمبەر و نێردراوی خودایت بەڵگەیەکمان پیشان بدە.



مووسا پێغەمبەریش ﷺ دەستی لە گیرفان و بەرباخەڵیدا دەرهێنا کە زۆر ڕووناك بوو و دەدرەوشایەوە و بەو سپێتی و پرشنگەی دەیدایەوە هەمووانی سەرسام دەکرد، هەروەها گۆچانەکەی دەستیشی فڕێدایە سەر زەوی و بە فەرمانی خودا بوو بە مارێکی گەورە و دەجووڵایەوە، بەڵام فیرعەون هەر نکۆڵی دەکرد و بە مووسا پێغەمبەری ﷺ وت: تۆ ساحیر و جادووگەریت، ئەوە سیحر و جادووت لە ئێمە کردووە، بۆیە دواتر فیرعەون بڕیاریدا هەموو ساحیر و جادووگەرەکان لە سەرانسەری میصردا کۆبکاتەوە، تاکو ساحیرەکانیش سیحر و جادوو پیشان بدەن، بەمەش خەڵکی لە مووسا پێغەمبەر ﷺ دەکشێنەوە و بانگەوازەکەشی پووچەڵ دەبێتەوە، بۆیە ڕۆژێکی جەژنی خۆیانی دانا بۆ بەیەکگەیشتنی ساحیرەکان لەگەڵ مووسا پێغەمبەردا ﷺ کە بەو ڕۆژەیان دەوت: ﴿ڕۆژی جوانی و خۆڕازاندنەوە﴾، لەو ڕۆژەدا بڕیاریاندا کە یەکەمجار ساحیرەکان سیحر و جادووی خۆیان بکەن.



بۆیە سیحری خۆیان کرد و هەندێ گوریسیان فڕێدا و بە سیحر و جادوو لەبەرچاوی خەڵکیدا بوونە ماری جۆراوجۆر، پاشان مووسا پێغەمبەریش ﷺ گۆچانەکەی دەستی فڕێدایە سەر زەوی و بە فەرمانی خودای گەورە گۆچانەکە بووە مارێکی گەورە و خێرا کەوتە قووتدانی هەموو مارەکانی تر، بەمەش سیحربازەکان شکستیان خوارد و بۆیان دەرکەوت کە بەڕاستی ئەمە بە هیچ جۆرێك سیحر نییە و موعجیزەیەکە و ڕوویداوە، بۆیە هەمووان بڕیاریاندا بڕوا بە مووسا پێغەمبەر ﷺ بکەن و کڕنووشیان بۆ خودای گەورە برد و وتیان: ﴿ئەوا ئێمە بڕوامان بە خودای پەروەردگاری جیهانیان هێنا، بە خودای مووسا و هاروون﴾، فیرعەونیش بەم کارەیان زۆر تووڕەبوو، بۆیە بڕیاریدا ئەگەر پەشیمان نەبنەوە ئەوا هەموو ساحیرەکان دەکوژێت، ساحیرەکانیش لە بڕواهێنانەکەیان بە خودای گەورە پەشیمان نەبوونەوە، فیرعەونیش هەموویانی کوشت.



هەروەها فیرعەون بەردەوام بوو لە ئازاردانی بەنو ئیسرائیل و سزا و ئازاردانەکانی لەسەریان زیاتر کرد، خودای گەورەش ڕێگەی دا بە مووسا و هاروونی برای کە بەنو ئیسرائیلیەکان ببەن و لە وڵاتی میصر بچنە دەرەوە، کاتێك گەیشتنە نزیکی ڕووباری نیل بەنو ئیسرائیلییەکان ترسی ئەوەیان هەبوو کە ئاوی ڕووباری نیل لە پێشیانەوەیە و ناتوانن لە ئاوەکە بپەڕنەوە، هەروەها لە دوایانەوە فیرعەونی لێیە، ترسی ئەوەشیان هەبوو کە فیرعەون هەموویان بکوژێت، کاتێك گەیشتنە لای ڕووباری نیل خودای گەورە سروشی بۆ مووسا پێغەمبەر کرد کە بە گۆچانەکەی دەستی بکێشێت بەئاوەکەدا، ئەویش کێشای بە ئاوەکەدا و ڕووباری نیل بوو بە کۆڵانێك و هەموویان بەناویدا پەڕینەوە، فیرعەونیش دوایان کەوت، بەڵام فیرعەون نوقمی ناو ئاوەکە بوو و خنکا و مووسا و هاروون و بەنو ئیسرائیلیەکان لە دەستی ئەو فیرعەونە زاڵمە ڕزگاریان بوو، ئەو پەیام و کتێبەی کە خوای گەورە بۆ حەزرەتی موسای ﷺ نارد ناوی ﴿تەورات﴾ بوو.



# چیرۆکی پێغەمبەران ﷺ

## داوود و سولەیمان ﷺ

دوای کۆچی دوایی مووسا پێغەمبەر ﷺ ماوەیەك تێپەڕی بەسەر گەلی بەنو ئیسرائیلدا، بەهۆی سەرپێچی و لووتبەرزی و بەدڕەفتارییانەوە خوای گەورە سزا و ئازارێکی زۆری دان و دەکەوتنە بەر شاڵاوی گەلانی دراوسێ، هەر بەوشێوەیە بەردەوام بوون تاکو هانایان بردە لای پێغەمبەرەکەیان کە داوا لە خوای گەورە بکات کەسێکیان بۆ هەڵبژێرێت کە سەرپەرشتییان بکات تاکو ڕیزەکانیان ڕێکبخەنەوە و بتوانن بەرگری لە خۆیان بکەن لە بەرامبەر ئەو گەلەی دراوسێیان کە هێرشی دەهێنایە سەریان و سەرکردەکەیان ناوی ﴿طالووت﴾ بوو، خودای گەورەش کەسێکی بۆ هەڵبژاردن بە ناوی (طالووت) کە پێشەوایەتی دەکردن، ئەوانیش سەرەڕای سەرپێچیکردنی زۆریش بەڵام لە دواتردا ناچاربوون و ڕازیبوون بە پێشەوایەتی ﴿طالووت﴾. ئەوانیش بە سەرکردایەتی ﴿طالووت﴾ی سەرکردەیان کەوتنەڕێ بۆ شەڕکردن لەگەڵ دراوسێکەیاندا کە ﴿طالووت﴾ سەرکردایەتی دەکرد، شەڕ دەستیپێکرد و گەنجێك توانی ﴿طالووت﴾ لەناوببات، ئەو گەنجەش ناوی ﴿داوود﴾ بوو.



پاشان ﴿داوود بووە﴾ پادشا و خوای گەورەش ﴿داوود﴾ی کردە پێغەمبەر و هەڵیبژارد بۆ گەلی بەنوئیسرائیل، خوای گەورە کتێبی ﴿زەبوور﴾ی بۆ ڕەوانەکرد، هەروەها لەگەڵ ئەوەشدا کە پێغەمبەری خودا بوو، پیشەی ﴿ئاسنگەری﴾ دەکرد، بۆیە خاوەنی جەستەیەکی بەهێز و پتەو بوو، هەروەها بانگەوازی گەلەکەی دەکرد بۆ پەرستنی خودای تاك و تەنها، زۆر بە دادپەروەرانە دادوەری بۆ گەلەکەی دەکرد و چارەسەری کێشە و گیروگرفتەکانیانی دەکرد، خودای گەورە کوڕێکی پێبەخشی ناوی ﴿سولەیمان﴾ بوو. پاش ئەوەی کە ﴿سولەیمان﴾ گەورەبوو، داوود پێغەمبەرﷺ کۆچی دوایی دەکات و سولەیمانی کوڕی شوێنی دەگرێتەوە، خودای گەورە ئەویشی وەکو پێغەمبەرێك ڕەوانەکرد بۆ گەلی بەنوئیسرائیل.



خودای گەورە دەسەڵاتێکی بەخشی بە سولەیمان پێغەمبەر ﷺ کە نە کەس لە پێش ئەو هەیبووە و نە لە دوای ئەویش کەسی تر ئەو دەسەڵاتەی دەبێت. هەروەها خودای گەورە زمانی هەموو تەیر و باڵندە و ئاژەڵەکانی فێرکردبوو و با و جنۆکەی بۆ ڕام کردبوو، ڕۆژێك سولەیمان پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ سوپاکەیدا دەڕۆیشتن، لە پێش ئەوەی کە بگەن بە دۆڵێك کە مێروولەیەکی زۆری لێدەبێت، یەکێك لە مێروولەکان هاوار دەکات و بانگی هاوڕێکانی دەکات و دەڵێت: هۆ مێروولەکان.. ئەوە سولەیمان و سەربازەکانی بە ناوچەکەی ئێوەدا دەڕۆن، خێرا خۆتان لە کونەکانتان بشارنەوە نەوەکو پێتان پێدا بنێن لە کاتێکدا ئاگایان لێتان نەبێت و هەستتان پێ نەکەن... کاتێك سولەیمان پێغەمبەر ﷺ گوێی لە قسەکانی ئەو مێروولەیە دەبێت، زۆر شادمان و دڵخۆش دەبێت و زۆر سوپاسی خودا دەکات کە ئەو هەموو ناز و نیعمەتانەی پێ بەخشیوە و فێری زمانی هەموو گیاندارانی کردووە.



ڕۆژێکی تر سولەیمان پێغەمبەر ﷺ فەرمانی دا بە هەموو سوپاکەی لە - ئادەمیزاد و جنۆکە و هەموو پەلەوەر و باڵندە و ئاژەڵەکان کە کۆببنەوە و چوو بەسەریان بکاتەوە، چاوی گێڕا و پەپوسلێمانەی نەبینی، بۆیە بڕیاریدا کە پەپوسلێمانە سەربیڕێت یان سزایەکی سەختی بدات، مەگەر ئەوەی بۆ ئەو دیارنەبوونەی پاساو و بیانوویەکی هەبێت، زۆری پێنەچوو کە پەپوسلێمانە هاتەوە و وتی: دەمەوێت هەواڵێکی ڕاست و دروستت پێ بدەم؛ گەلێکم بینی لە شاری ﴿سەبەء﴾ لە وڵاتی یەمەن کە ژنێك بەڕێوەی دەبات، بەڵام گومڕابوون و لە بری خوداپەرستی ئەوان خۆر دەپەرستن، سولەیمان کە ئەمەی بیست نامەیەکی دا بە پەپوسلێمانە کە بیگەیەنێتە دەستی پادشای ئەو وڵاتە کە ناوی ﴿بەڵقیس﴾ە، لە نامەکەیدا باسی ئەوەی دەکرد کە: بەڵقیس و گەلەکەی بێن و ببنە موسوڵمان و لەبری پەرستنی خۆر تەنها خودا بپەرستن.



بەڵقیسیش نامەکەی خوێندەوە و پرس و ڕاوێژی بە کاربەدەست و پیاوماقوڵانی گەلەکەی کرد، ئەوانیش وتیان: ئێمە بەهێز و بەتوانا و بە دەسەڵاتین با لەگەڵیاندا بجەنگین، بەڵام دوابڕیاریش هی تۆیە چۆنت دەوێت وابڕیاربدە.

بەڵقیسیش بۆی ڕوونکردنەوە و وتی: هەر شوێنێك شەڕ و جەنگ تێیدا ڕوویدابێت و هەر پادشایەك بدات بەسەر هەر وڵاتێکدا ئەوا ئەو شوێنە وێران دەکەن و گەلەکەیشی ملکەچ و ڕیسوا دەکەن، بۆیە من نێردراو و هەندێ دیاری بۆ دەنێرم بزانم چی دەڵێت؟

کاتێك دیارییەکانیان برد سولەیمان پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەو دیارییانە بگێڕنەوە بۆ پادشاکەتان، چونکە خودای گەورە ناز و نیعمەت و دەسەڵاتێکی زۆر فراوانتری بە من بەخشیوە، بگەڕێنەوە و پێی بڵێن ئەگەر موسوڵمان نەبێت ئەوا بە سوپا و هێزێکی هێندە زۆرەوە دێم کە ڕیسوا و سەرشۆڕبن.



نێردراوەکان گەڕانەوە بۆ لای بەڵقیس و وەڵامەکەیان پێیدا، ئەویش بڕیاریدا خۆی و کۆمەڵێك لە کاربەدەستانی وڵاتەکەی بچن بۆ چاوپێکەوتنی سولەیمان پێغەمبەرﷺ، کاتێك سولەیمان پێغەمبەرﷺ زانی کە بەڵقیس دێت بۆ لای، ویستی توانا و دەسەڵاتی خۆی پیشان بدات، تاکو زووتر موسوڵمان ببن، بیستبووی کە بەڵقیس تەختێکی شاهانەی هەیە، بۆیە کۆبوونەوەیەکی کرد و لەناو زانایان و سەرکردە و شارەزایانی گەلەکەیدا وتی: کێ دەتوانێت تەختی بەڵقیسم بۆ بهێنێت؟ تەختەکەی بەڵقیس زۆر ناوازە و نایاب بووە و لە ئاڵتوون و زێڕ و مرواری و گەوهەر دروستکرابوو.



یەکێك لە جنۆکە زەبەلاحەکان وتی: من تەختەکەیت بۆ دەهێنم پێش ئەوەی ئەم کۆبوونەوە و دانیشتنە تەواو بکەن و کۆتایی پێبهێنن. یەکێکی تر لە زانایانی ناو دانیشتنەکە وتی: من تەختەکەی دەهێنمە بەردەمت لە ماوەی چاوترووکاندنێکدا پێش ئەوەی چاوەکانت بکەیتەوە، چاوی تroوکاند و چاوی کردەوە بینی تەختەکەی بەڵقیس لەبەردەمیدایە، بۆیە سوپاسێکی زۆری خودای گەورەی کرد بۆ ئەو هەموو دەسەڵات و نیعمەتانەی پێی بەخشیوە، فەرمووی هەندێك دەستکاری لەو تەختەدا بکەن و گۆڕانکاری تێدا بکەن تاکو نەیناسێتەوە.

کاتێك بەڵقیس هات بۆ لای سولەیمان، تەختەکەی بینی کە لەوەی خۆی دەچێت بەڵام ئەویش نییە، دواتر بۆی دەرکەوت کە ئەو تەختە هەمان تەختەکەی خۆیەتی، بۆیە دوای گفتوگۆکردن لەگەڵ سولەیمان پێغەمبەردا ﷺ بەڵقیس و گەلەکەی بڕوایان بە تاك و تەنهایی خوای گەورە هێنا و موسوڵمان بوون.



ڕۆژێك سولەیمان پێغەمبەر ﷺ خۆی دابوو بەسەر عەساکەیدا و چاودێری جنۆکەکانی دەکرد، بەڵام هەر بەوشێوەیە کۆچی دوایی کردبوو، جنۆکەکانیش پێیان نەزانی بوو، هەر خەریکی کارکردنی خۆیان بوون، تاکو ماوەیەکی زۆر مۆرانە دابووی لە عەساکە و کرمۆڵیان کردبوو، بەمەش عەساکە شکا و کەوت و بە کەوتنی عەساکەیش سولەیمان پێغەمبەر ﷺ کەوت بە زەویدا، بەهۆی ئەوەشەوە جنۆکەکان بۆیان دەرکەوت کە ماوەیەکی زۆرە سولەیمان پێغەمبەر ﷺ کۆچی دوایی کردووە، بەمەش بۆ جنۆکەکان و خەڵکیش دەرکەوت کە جنۆکەکان هیچ لە غەیب نازانن و تەنها خوای گەورە خۆیەتی ئاگاداری غەیبە.



# چیرۆکی یونس پێغەمبەر ﷺ

خودای گەورە یونس پێغەمبەری ﷺ نارد بۆ لای دانیشتووانی ناوچەیەك کە ناوی ﴿نەینەوا﴾ بوو، شارێك بوو لە عێراقی کۆندا کە ژمارەی دانیشتووانەکەی لە ﴿١٠٠٠٠٠﴾ سەد هەزار کەس زیاتر بوو.

یونس پێغەمبەریش ﷺ خۆی تەرخانکرد و هەوڵ و کۆششێکی زۆری دا بۆ بانگەوازکردن بۆ لای خودا و پەرستنی خودای گەورەی تاك و تەنها، سەرەڕای ئەوەی بەردەوام بوو لە بانگەوازکردن بۆ ئایینی خودا، بەڵام گەلەکەی گوێیان بۆ نەگرت و لەسەر بێباوەڕی و کەللەڕەقی خۆیان سووربوون و باوەڕیان پێنەکرد.

یونس پێغەمبەریش ﷺ، لەم ڕەفتار و هەڵوێستانەی گەلەکەی زۆر تووڕەبوو، هەڕەشەی سزای سەختی خودایی لێدەکردن. بۆیە لە شارەکە چووە دەرەوە و ئەو ناوچەیەی بەجێهێشت.

ڕۆیشت و ڕوویکردە کەناری دەریا و لەو کاتەدا خەریك بوو خۆر ئاوا دەبوو، بۆیە کەشتییەکی بینی لەسەر ڕۆیشتن بوو، ئەویش داوای لە سەرنشینانی کرد کە یارمەتی بدەن و لەگەڵ خۆیاندا بیبەن.



ئەوانیش داواکەیان جێبەجێکرد و سواری کەشتییەکە بوو و ئەو ناوچەیەی بەجێهێشت، کە چوونە ناو دەریاوە خودای گەورە گەردەلوولێکی بەهێزی هەڵکرد و شەپۆلەکانی دەریاکە زۆر بەهێزبوون و کەشتییەوان و سەرنشینەکانی کەشتییەکە زۆر ترسان کە کەشتییەکەیان نوقووم ببێت، بۆیە وتیان: دیارە کەسێکی گوناهبارمان تێدایە بۆیە وامان لێ بەسەر دێت. ئینجا لەنێو خۆیاندا ڕاوێژیان کرد کە یەکێکیان لەسەر کەشتییەکە هەڵبدەنە ناو ئاوی دەریاکەوە تاکو ڕزگاریان ببێت.

بۆیە بە تیروپشك هەڵبژاردنیان کرد ناوی یونس پێغەمبەر ﷺ دەرچوو، یونسیش باسی خۆی بۆ گێڕابوونەوە، ئەوانیش وتیان ناکرێت ئەم کەسێکی تاوانباربێت، بۆیە تیروپشکەکەیان دووبارە کردەوە، بەڵام بۆ جاری دووەمیش هەر یونس پێغەمبەر ﷺ دەرچووەوە، بۆیە ویستی خۆی ئامادە بکات بۆ ئەوەی خۆی هەڵبداتە ناو دەریاوە، بەڵام ئەوان ویستیان تیروپشکێکی تر ئەنجام بدەن، بۆ سێیەمجاریش بە ویستی خودا لە تیروپشکەکەدا هەر ناوی ئەو دەرچوو.



بۆیە هەڵیاندایە ناو ئاوی دەریاکەوە، لەو کاتەدا خوای گەورە نەهەنگێکی بۆ نارد و قووتی دا، خودای گەورەش ئەو نەهەنگەی ئاگادارکردبوو کە هیچ زیانێك بە یونس پێغەمبەرﷺ نەگەیەنێت، بۆیە لە بۆشایی سکی نەهەنگەکەدا تەخت کەوتبوو.

بەڵام وردەوردە دەست و قاچی کەوتە جووڵاندن و بۆی دەرکەوت کە هێشتا زیندووە و نەمردووە، لەو کاتەدا هەستی کرد کە هەڵەی کردووە و گوناهێکی گەورەی ئەنجام داوە کە بە بێ فەرمانی خودای گەورە ئەو گەلەی خۆی بەجێهێشتووە، بۆیە کڕنووشی بۆ خودا برد و دوعایەکی کرد و وتی:

واتە: خودایە لە تۆ بەولاوە خوایەکی تر نییە بە حەق بپەرسترێت، تۆ لە هەموو کەموکوورتی و ناتەواوییەك پاك و بێگەردیت و منیش یەکێك بووم لەوانەی ستەمیان لە خۆیان کردووە، دەی سا فریام بکەوە.

خوای گەورەش نزاکەی گیراکرد و لێی خۆشبوو و نەهەنگەکەی ئاگادارکردەوە بە بێ ئەوەی زیان بە یونس بگات فڕێیبداتە دەرەوەی دەریاکە و ڕزگاری ببێت.



یونس پێغەمبەریش ﷺ لاواز و بێهێزبووبوو و لە کەناری دەریاکە خۆی بە گەڵای کولەکە داپۆشی؛ کە خودای گەورە لەو شوێنەدا بۆ پاراستنی یونس ڕواندبووی. لەو حاڵەدابوو تاکو چاکبووەوە و ترس و ئازاری نەما و دەروونی هێمن بووەوە، دواتر بڕیاریدا بگەڕێتەوە بۆ ناو گەلەکەی خۆی.

لەو ماوەیەشدا کە یونس پێغەمبەر ﷺ گەلەکەی بەجێهێشتبوو، هەموو گەلەکەی بۆیان دەرکەوتبوو کە تووشی سزای خودا دەبن بۆیە گەڕابوونەوە بۆ لای خودا و پەشیمان بووبوونەوە، یونس پێغەمبەریش کە گەڕایەوە بۆ لایان بانگی کردن بۆ بڕواهێنان و پەرستنی خوای تاك و تەنها و ئەوانیش بڕوایان بە خودا هێنا و ڕێگەی هیدایەتیان گرتەبەر، خودای گەورەش ژیانێکی خۆش و ئاسوودەی پێبەخشین و بەختەوەری کردن.



# چیرۆکی عیسا پێغەمبەر ﷺ

لە سەردەمی زەکەریا پێغەمبەردا ﷺ پیاوچاکێك هەبوو کە ناوی عیمران بوو و ژنێکی هەبوو، بەڵام ژنەکەی نەزۆك بوو و منداڵی نەدەبوو، بۆیە ڕۆژێکیان ژنەکەی دوعای کرد کە خودای گەورە کوڕێکی پێ ببەخشێت، ئەمیش نەزری کرد بۆ خودای گەورە بۆ ئەوەی خزمەتی ﴿بەیتول موقەددەس﴾ بکات، خودای گەورەش نزاکەی گیراکرد هەرچەندە کە نەزۆکیش بوو، بەڵام منداڵێکی پێبەخشی، پێش ئەوەی منداڵەکە لەدایك ببێت عیمرانی هاوسەری مرد و کۆچی دوایی کرد، کاتێك منداڵەکە لەدایکبوو، کچێکی جوان بوو و ناوی لێنا ﴿مەریەم﴾.



خێزانەکەی عیمرانیش کاتێ منداڵەکەی وردە وردە گەورە دەبوو نەزرەکەی بەجێهێنا و ویستی بیبات بۆ بەیتول موقەددەس بۆ ئەوەی هەر خەریکی خوداپەرستی بێت.

بۆیە هەر لە منداڵییەوە مەریەم لە ﴿بەیتول موقەددەس﴾ بوو، بۆ کارێکی پێویست نەبووایە لە مزگەوت نەدەچووە دەرەوە، بۆ ئەوەی کە کەسێکیش لە نێوان پیاوە زانا و دیندارەکانی بەیتول موقەددەسدا سەرپەرشتی ئەو منداڵە بکات بۆیە تیروپشکیان بۆ کرد زەکەریا پێغەمبەرﷺ دەرچوو، چەندجارێك تیروپشکەکەیان دووبارە کردەوە هەر زەکەریا پێغەمبەرﷺ دەردەچوو، کە مێردی پووری مەریەمیش بوو.



بۆیە ئەویش سەرپەرشتی و پەروەردەکردنی مەریەمی گرتە ئەستۆی خۆی، مەریەم هەر لە منداڵییەوە لەسەر خوداپەرستی و پاکی و ڕەوشتبەرزی گەورەبوو، تاکو گەیشتە ئەوەی لە ناو بەنوئیسرائیلدا بە خوداپەرست و پاك و ڕەوشتبەرز ناسرا.

ڕۆژێك جوبرەئیلی فریشتە دێتە لای مەریەم، ئەویش زۆر دەترسێت، جوبرەئیلیش پێی وت: مەترسە من لە لایەن خودای گەورەوە نێردراوم، هەروەها موژدەی پێدەدات و هەواڵی ئەوەی پێدەدات کە خودای گەورە کوڕێکی پێدەبەخشێت، ئەویش تووشی سەرسووڕمان بوو کە چۆن منداڵی دەبێت لەکاتێکدا شوووی نەکردووە؟



جوبرەئیلیش وەڵامی دەداتەوە کە ئەوە ویستی خودای گەورەیە و ئەو کارە بەلای خودای گەورەوە ئاسانە، هەرکارێك خودا بیەوێت هەر ئەو کارە دەبێت، پاشان موژدەی دا بە مەریەم کە کوڕەکەی دەبێت بە بەڵگە و نیشانە و موعجیزەیەکی گەورە لەلایەن خوداوە بۆ خەڵکی، کاتێك خاتوو مەریەم سکی پڕبوو، خۆی بەدوورگرت لە خەڵکی و دوورەپەرێزی گرت، تاکو منداڵێکی جوانی بوو ناوی ﴿عیسا﴾ بوو.



کاتێك مەریەم بە منداڵێکەوە هات بۆ ناو گەلەکەی، خەڵکیش پێیان سەیربوو کە مەریەم منداڵێکی لە باوەشدایە، بۆیە پرسیاریان لێکرد، ئەویش هیچ وەڵامی کەسی نەدەدایەوە، تەنها بە دەستی ئاماژەی دەکرد بۆ منداڵەکەی، خەڵکیش دەیانوت: چۆن منداڵێکی تازە لەدایکبوو قسە دەکات، بەڵام لە بەرچاوی خەڵکیدا موعجیزەیەکی گەورە ڕوویدا و بە فەرمانی خودای گەورە ئەو منداڵە تازە لەدایکبووە کەوتە قسەکردن و وتی: ﴿من بەندەی خودام و خوای گەورە منی کردووە بە پێغەمبەری خۆی﴾.



بۆیە هەندێك لە خەڵكی بڕوایان بەو موعجیزە گەورەیە كرد و هەندێكی تریشیان هەر بڕوایان پێ نەكرد و حەسادەتیان پێبرد، ئەو جولەكانەی كە بڕوایان پێ نەكرد ویستیان زیان بە مەریەم و كۆرپەكەی بگەیەنن. مەریەمیش بۆ پاراستنی گیانی خۆی و كۆرپەكەی گەشتی كرد و چوو بۆ وڵاتی میصر، عیسا بە سەرپەرشتی و چاودێری دایكی پەروەردەیەكی باشی وەرگرت و گەورە بوو، پاش ئەوەی كە ماوەیەك لە میصر مانەوە، پاشان مەریەم و كوڕەكەی گەڕانەوە بۆ فەلەستین و بۆ بەیتول موقەددەس.



کاتێکیش عیسا پێغەمبەر ﷺ گەورە بوو، خودای گەورە ئینجیلی بۆ ڕەوانەکرد، ئەویش خەڵکی بانگدەکرد بۆ ناسین و پەرستنی خودای تاك و تەنها و خەڵکی فێری ئینجیل دەکرد، خودای گەورەش پشتگیری ئایینەکەی عیسا پێغەمبەری ﷺ بە چەند موعجیزەیەك کرد، لەوانە: بە فەرمانی خودای گەورە کەسی کوێر و نابینا و کەسی نەخۆشی چاکدەکردەوە و بە فەرمانی خودا مردووی زیندوو دەکردەوە، پاشان هەواڵی بە خەڵکی دەدا کە چی خواردنێك دەخۆن و چی شتێك پاشەکەوت دەکەن.

هەروەها هاوەڵەکانی حەزرەتی عیسا داوایان لێ کرد کە عیسا پێغەمبەر ﷺ داوا لە خودای گەورە بکات سفرەیەکی خواردنیان لە ئاسمانەوە بۆ بنێرێتە خوارەوە.



ئەویش داوای لە خودای گەورە کرد، خودای گەورەش سفرەیەکی گەورەی خواردنی بۆ ناردنە خوارەوە و هەمووان بە دەوڵەمەند و هەژارەوە لێیان خوارد و کردیانە جەژنێك لە جەژنەکانی خۆیان.

سەرەڕای ئەو هەموو هەوڵدانەی عیسا پێغەمبەر ﷺ بۆ بانگەوازکردن و بانگکردنی بەنو ئیسرائیل و ئەو هەموو موعجیزەیەش کە ڕوویدابوو، بەڵام کۆمەڵێکی کەم نەبێت بڕوایان پێ نەکرد و شوێنی نەکەوتن، هەروەها پیلانیان بۆ دانا کە بیکوژن، بەڵام خودای گەورە کەسێکی تری خستە سەر شێوەی ئەو، جولەکەکانیش ئەو کەسەیان لەناوبرد، خودای گەورەش عیسا پێغەمبەری ﷺ ڕزگارکرد و پاراستی و بەرزی کردەوە بۆ ئاسمان.



# چیرۆکی محەممەد پێغەمبەر ﷺ

ئەو ساڵەی محەممەد ﷺ تێیدا لەدایکبوو، ناونراوە بە: ﴿ساڵی فیل﴾، ئەوەش بەهۆی ڕووداوێکەوە بوو، کە تێیدا پاشای ئەو کاتەی وڵاتی حەبەشە ناوی ﴿ئەبرەهە﴾ بوو، کە لە حەبەشە ماڵێکی دروستکردبوو ناوی نابوو: ﴿قولەیس﴾، ئەویش بۆ ئەوەی خەڵکی لەبری ئەوەی بچن بۆ زیارەتی ﴿کەعبە﴾ بۆ حەج و تەواف، بچنە ئەو ماڵەی کە ئەو دروستی کردبوو، بۆیە بە سوپایەکەوە هات بۆ ئەوەی ﴿کەعبە﴾ بڕوخێنێت، چەندین فیلی گەورەشی لە پێشی سوپاکەیەوە دانابوو، کاتێك چوونە شاری مەککە بۆ ئەوەی ﴿کەعبە﴾ بڕوخێنن، فیلەکان ڕوویان نەدەکردە کەعبە و بەپێچەوانەوە دەڕۆیشتن.



لـەو کاتی هێرشـکردنەدا بوو کـە خودای گەورە بەهـۆی باڵندەی ﴿تەیرەن ئەبابیـل﴾ەوە ﴿کە وەك پەرەسـێلکە﴾ وایـە، گڵەبەردینەیان دەخسـتە خوارەوە بۆ سـەر سـوپاکە و هەموو سـوپاکەی تەفروتووناکرد، بـەوەش ﴿کەعبە﴾ی پاراسـت لەوەی کـە ئەبرەهە و سـوپاکەی بیڕوخێنـن، محەمەدﷺ لـەو سـاڵەدا لەدایکبوو، پێغەمبـەری خۆشەویسـتمانﷺ کە ناوی ﴿محەمـەدی کـوڕی عەبدوڵـڵای کـوڕی عەبدولموتەلیـب﴾ە، دایکی نـاوی خاتوو ﴿ئامینـەی کچی وەهـەب﴾ە، دوای ئەوەی کە عەبدوڵـڵا خاتوو ئامینەی خواسـت و بـوو بە هاوسـەری، عەبدوڵڵا بە مەبەسـتی بازرگانی ڕۆیشـت و پێش ئەوەی بگەڕێتەوە لە شـاری ﴿یەسریب﴾کۆچـی دوایی کرد.



﴿كە دواتر پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ ناوەکەی گـۆڕی بـۆ مەدینـە﴾، دوای ماوەیەك لـە کۆچی دوایـی عەبدوڵـڵا، محەمـەد ﷺ لەدایکبوو، دایکی و باپیریشـی زۆر دڵخۆشـبوون بـە لەدایکبوونـی، کـە محەمـەد لەدایکبـوو، وەکو عادەتـی ئەوکاتە منداڵەکانیـان دەدا بە دایەنێـك بۆ ئەوەی منداڵەکـە لە بیاباندا گـەورە ببێت، کە هەم فێری ئاکار و ڕەوشـت و ڕەفتـارە جوانەکان بێت، هـەم زمانی پاراو بێت و جەسـتەیەکی تۆکمە و بەهێزیشـی ببێت. بۆیە دایك و باپیـری موحەمەدیان ﷺ دا بە خاتـوو ﴿حەلیمەی سـەعدییە﴾، کە وەکـو دایەنی بەخێوی بـکات. تاکـو تەمەنی بوو بـە پێنج سـاڵی لای خاتوو حەلیمـە مایـەوە، دوای ئەو ماوەیـە محەمەدی ﷺ گەڕانـدەوە بۆ لای دایکـی و باپیری.



کاتێك تەمەنی گەیشـــتە شـەش ســاڵ،
دایکی بــردی بۆ ســەردانی گۆڕەکەی باوکـــی کە ناوی ﴿عەبدوڵلا﴾بـوو، هەروەهــا بۆ ســەردانی شــاری یەسریب بــۆ ماڵــی خــزم و خاڵەکانــی، بــەڵام لەکاتـــی گەڕانەوەیاندا خاتـــوو ﴿ئامینـــە﴾ی دایکـــی نەخـــۆش دەکەوێـــت و بەهۆی ئــەو نەخۆشییەشـــەوە کۆچـــی دوایـــی دەکات، بۆیـــە ﴿ئـوم ئەیمـــەن﴾ کــە دایەنی بــوو، محەمــەدی گەڕانــدەوە بۆ لای ﴿عەبدولموتەلیـب﴾ی باپیـــری، تاکـــو لەژێر سەرپەرشـــتی باپیریـــدا بێــت و چاودێری و پــەروەردە بکرێت. پــاش ئەوەی ماوەیــەك محەمــەد لای باپیریشـــی مایەوە و سەرپەرشـــتی و بەخێـــوی کرد، بەڵام لە تەمەنی هەشـــت ســاڵیدا باپیریشـــی کۆچـــی دوایـــی کرد.



بۆیە محەمەدﷺ بە بێباوك و دایك و بە بێ کەسیی مایەوە، دواتر ﴿ئەبوتالیب﴾ی مامی سەرپەرشتیکرد و بەشێوەیەکی زۆر جوان و وەکو منداڵەکانی خۆی بەخێویکرد.

محەمەدیشﷺ هەر لە منداڵییەوە خەریکی شوانی و مەڕ و ماڵات لەوەڕاندن بوو، کاتێك محەمەد گەورە بوو، ئاکار و ڕەوشتێکی زۆر بەرزی هەبوو، هەروەها لەبەر ڕاستگۆیی و دەستپاکی و ڕەوشتبەرزی لەناو خەڵکیدا نازناوی ﴿ڕاستگۆی دەستپاك﴾ی لێنرا.

محەمەدﷺ کاری بازرگانی بۆ کەسێك کرد کە ناوی خاتوو خەدیجە بوو، کە یەکێك بوو لە ئافرەتە بەڕێز و دەوڵەمەندەکانی شاری ﴿مەککە﴾ و کاری بازرگانی دەکرد، بۆیە محەمەدی وەکو سەرۆك و لێپرساوی کاروانێکی بازرگانی نارد بۆ وڵاتی شام، بۆ ئەوەی بازرگانی بۆ بکات.



محەمەد لەوکاتەدا لاوێکی پێگەیشتوو بوو، خاتوو خەدیجە لەبەر دەستپاکی و ڕاستگۆیی و سەرڕاستی محەمەدی هەڵبژارد، تاکو ئەو کارە بگرێتە ئەستۆی خۆی، ئەویش گەشتی بازرگانییەکەی تەواوکرد و گەڕایەوە و قازانج و خێروبێرێکی زۆری بۆ خاتوو خەدیجە گەڕاندەوە.

پاش تێپەڕینی ماوەیەك لە گەڕانەوەی لە بازرگانییەکە، محەمەدﷺ لە تەمەنی بیست و پێنج ساڵیدابوو کە خاتوو خەدیجەی مارەکرد و ژیانی هاوسەری لەگەڵیدا پێکهێنا، کە لەوکاتەدا خەدیجەی کچی خوەیلد تەمەنی چل ساڵان بوو، خوای گەورە چەند منداڵێکی بە محەمەدﷺ و خاتوو خەدیجە بەخشی، ئەوانیش: ﴿قاسم و عبدالله و زەینەب و روقیە و ئوم کلثوم و فاطمە﴾ بوون. کە هەردوو کوڕەکەی هەر بە منداڵی کۆچی دواییان کرد.



دوای تێپەڕینی ماوەیەك لە هاوسەرگیریی کردنی محەمەدﷺ، سەرگەورەکانی مەککە بڕیاریاندا کە ماڵی خودا ﴿کەعبەی پیرۆز﴾ نۆژەن بکەنەوە، لەبەرئەوەی خەریك بوو دەڕووخا، لەکاتی تەواوبوونی کەعبەدا خەریك بوو کێشە بکەوێتە نێوان سەرۆکی هۆزەکانەوە لەسەر ئەوەی کە کامیان بەردەڕەشەکە بخاتەوە شوێنەکەی خۆی، بۆیە محەمەدﷺ ئەو کێشەیەی بە شێوازێکی ژیرانە و دانایانە بۆ چارەسەرکردن، ئەویش بەوەی عاباکەی دانا و بەردەڕەشەکەی خستە سەری و هەر چمکێکی عاباکەی دا بە یەکێك لە نوێنەری هۆزەکان، تاکو عاباکە بەرز بکەنەوە، محەمەدیشﷺ بەدەستە پیرۆزەکانی خۆی بەردەڕەشەکەی خستەوە شوێنەکەی خۆی، بەمەش هەموو هۆزەکانی لە ڕوودانی شەڕ و ئاژاوە بەدوور گرت و ئەو کێشەیەی بۆ چارەسەرکردن.



محەمەدﷺ بژێوی ژیانی بە ئیشکردن و کارکردن دابین دەکرد، هەروەها بەردەوام منداڵانی خۆشدەویست و یارمەتی دەدان و دەستگیرۆیی کەسانی لێقەوماو و هەژاریشی دەکرد.

محەمەدﷺ زۆر سەردانی ئەشکەوتی ﴿حیرِرا﴾ی لە کێوی نور دەکرد، خاتوو خەدیجەی هاوسەریشی خواردنی بۆ ئامادە دەکرد، محەمەدیش لەو ئەشکەوتە دەمایەوە بۆ ئەوەی خوداپەرستی بکات و بیر لە دەسەڵاتی خودا بکاتەوە، کاتێك لە ئەشکەوتەکەدا خەریکی خوداپەرستی بوو، جوبرەئیلی فریشتە هاتە خوارەوە بۆ لای و پەیامی خودای بۆ هێنا و چەند ئایەتێکی قورئانی پیرۆزی بۆ دابەزاند، ئەویش بەپەلە گەڕایەوە ماڵەوە، دواتر لەگەڵ خاتوو خەدیجەدا چوون بۆ لای کابرایەکی بەتەمەن کە ناوی ﴿وەرەقەی کوڕی نەوفل﴾ بوو، وەرەقەش پێی وت: مژدەت لێبێت، ئەوا تۆ بوویت بە پێغەمبەر.



لەدوای ئەو ڕووداوانە خەدیجە یەکەم کەس بوو
کە موسوڵمان بوو و باوەڕی بە پێغەمبەرﷺ هێنا. دوای ئەویش
ئەبوبەکری صدیق و عەلی کوڕی ئەبوتالیبیش موسوڵمان بوون.
وردەوردە ژمارەی موسوڵمانان زیادی دەکرد، پێغەمبەریشمانﷺ موسوڵمانانی کۆدەکردەوە و فێری ئاینی ئیسلامی دەکردن و باسی تاك و تەنهایی خوای گەورە و دەسەڵاتی خوای گەورەی بۆ دەکردن و ئامۆژگاری دەکردن، هەروەها پێغەمبەرمان ئازیزمان محەمەدﷺ لە شاری مەککەدا دەستی کرد بە بانگەوازکردن، ئەویش چووەسەر کێوی سەفا و خەڵکی مەککەی کۆکردەوە و پێی ڕاگەیاندن کە خوای گەورە کردوویەتی بە پێغەمبەر و قورئانی بۆ دابەزاندووە. بۆیە هەندێك کەس باوەڕیان پێ کرد و زۆربەی خەڵکی مەککەیش بڕوایان پێ نەهێنا. سەرەڕای



ئەوەش کەوتنە دژایەتیکردنی موسوڵمانەکان و زۆریش ئازاری موسوڵمانەکانیان دەدا و هەوڵیان دەدا لە ئایینی ئیسلام پەشیمان ببنەوە، هێندە زۆر ئازاری پێغەمبەرﷺ و موسوڵمانەکانیان دەدا، تاکو گەیشتە ئەوەی بوونە هۆی شەهیدکردنی ئافرەتێکی موسوڵمان بەناوی ﴿سومەییە﴾، بەمەش ئەو ئافرەتە بووە یەکەم شەهید لە ئیسلامدا، پاشان هاوسەرەکەی سومەییەشیان بەناوی ﴿یاسر﴾ شەهیدکرد.

بێباوەڕکان بەردەوام بوون بە قسەپێگوتن و گاڵتەپێکردن و ئازاردانی موسوڵمانەکان، تاکو ئەوەی کە هەموو بێباوەڕەکان کۆبوونەوە و بڕیاریاندا کە هەموو پەیوەندییەکانیان لەگەڵ موسوڵماناندا بپچڕێنن و شتیان پێ نەفرۆشن و تێکەڵییشیان لەگەڵدا نەکەن و ئابڵۆقەیان خستەسەر موسوڵمانان.



موســـوڵمانانیش بەناچاری چوونە شوێنێك پێی دەگوترا شـــیوی ئەبوتالیب و لەوێدا کۆبوونەوە.

موســـوڵمانان لەو شـــیوەدا زۆر ئازاردران و تووشـــی ناڕەحەتییەکی زۆربوونـــەوە، تەنانەت گەیشـــتە ئـــەوەی کە هێندە برســـی بوون کە خواردنیشـــیان نەبوو بیخـــۆن، بۆیە بەناچاری گـــەڵای درەختەکانیان دەخـــوارد. هیچ کەســـێکیش نەیدەتوانی یارمەتییان بـــدات، چونکە بێباوەڕەکانـــی مەککە ســـزای ئەو کەسانەشـــیان دەدا کـــە یارمەتی موســـوڵمانەکانی بدایە.

تاکو خوای گـــەورە ڕزگاری کردن، ئەویش بەوەی ئـــەو ڕیککەوتنەیان کـــە نووســـیبوویان بـــۆ ئـــەو ئابلۆقەدانـــەی موســـوڵمانەکان، لەناو کەعبـــەدا هەڵیانواســـیبوو، مۆرانە هەمـــوو کاغەزەکـــەی خواردبوو، تەنها نـــاوی ﴿الله﴾ نەبێـــت کە لەســـەر کاغەزەکـــە نووسرابوو.



بۆیە ئەو ڕێککەوتنەیان هەڵوەشایەوە و ئەو سزا و ئابڵۆقەدانە لەسەر موسوڵمانەکان هەڵگیرا و موسوڵمانان توانییان بچنەوە ناو مەککە و بچنەوە ناو ماڵەکانی خۆیانەوە. کە ئەو ئابڵۆقەدانە ماوەی سێ ساڵی خایاند، دوای ماوەیەك لە ڕزگاربوونیان لەو ئابڵۆقەدانە، ئەبوتالیبی مامی پێغەمبەرمان ﷺ کۆچی دوایی کرد، هەر لەو ساڵەشدا خاتوو خەدیجەی هاوسەری پێغەمبەر ﷺ کۆچی دوایی کرد، ئەم ڕووداوانە زۆر قورس بوو لەسەر پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ، بۆیە ئەو ساڵە ناونرا: ساڵی ماتەمینی.

لە دوای کۆچی دوایی ئەبوتالیب قوڕەیشییەکان زۆر زیاتر ئازاری موسوڵمانانیان دەدا، تاکو ئەوەی پێغەمبەرمان ﷺ چوو بۆ شاری ﴿طائیف﴾ بۆ ئەوەی کەسانێك بدۆزێتەوە یارمەتی بدەن، بەڵام ئەوانیش زۆر ئازاریان دا و بە ناڕەحەتی گەڕایەوە بۆ مەککە، لەدوای ئەمانە خوای گەورە گەشتی ﴿ئیسرا و میعراج﴾ی بە پێغەمبەرمان ئەنجامدا و تێیدا نوێژ لەسەر موسوڵمانان فەرزکرا ﴿کە لە شەو و ڕۆژێکدا پێنج نوێژە﴾.



بەبەردەوامـــی پێغەمبەرمـــان ﷺ دەگـــەڕا تاکو خەڵکـــی بانگ بـــکات بۆ ئاییـنـــی ئیســـلام، تاکو لـــە یەکێك لە وەرزەکانـــی حەجکردنـــدا، پێغەمبەری خۆشەویســـت ﷺ دەگەڕا، تاکو لە هـــۆزە جیاوازەکانـــدا خەڵکی بانگ بـــکات بۆ ئایینی ئیســـلام، بۆیە لەگەڵ کۆمەڵێـــك خەڵکی شـــاری یەسریبدا کۆبووەوە و بانگهێشـــتی کـــردن بۆ ئەوەی ئایینی ئیســـلام وەربگرن و ببنە موســـوڵمان. ئەوانیش بڕوایان پێکرد و ســـاڵی داهاتووتـــر هاتنەوە و ژمارەیان زیاتـــر بوو، بۆیە پێغەمبەریش ﷺ کەســـێکی لەگـــەڵ نـــاردن، تاکو لە ئایینی ئیســـلام شـــارەزایان بـــکات و ئامۆژگارییان بکات.

ئەو کەســـانەی شـــاری مەککە کە بڕوایان بە پێغەمبەرمان ﷺ نەکردبوو، بەردەوام بوون لە ئازاردانی پێغەمبەر ﷺ و موســـوڵمانەکان.



بۆیـــە خوای گـــەورە ڕێگـــەی دا بـــە پێغەمبەری خۆشەویســـتمان ﷺ و موســـوڵمانەکان کە کۆچ بکەن بۆ شاری یەسریـــب، پێغەمبـــەری خۆشەویســـتمان ﷺ لـــە پـــاش کۆچکردنی موســـوڵمانەکان، خۆیشـــی لەگەڵ (ئەبوبەکـــر)ی هاوڕێیـــدا بەیەکەوە کۆچیان کـــرد بۆ شـــاری یەسریب.

پاشـــان پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ئەبوبەکری هاوەڵیدا بەرەو شـــاری یەسریب بەڕێکەوتن، لەڕێگەدا تووشـــی زۆر ناخۆشـــی و ناڕەحەتی بوون و دوای چەند ڕۆژێك گەیشـــتنە ئەوێ، خەڵکیش پێشـــوازییەکی گەرموگوڕیان لێکـــردن و بەخێرهاتنیـــان کـــردن، پێغەمبەریش ﷺ ناوی شـــاری ﴿یەسریب﴾ی گۆڕیی بۆ شـــاری ﴿مەدینە﴾.

پاشـــان پێغەمبـــەر ﷺ لە شـــاری مەدینـــەدا چەنـــد کارێکـــی گرنگی ئەنجامـــدا، لەوانـــەش: دروســـتکردنی مزگـــەوت، وەکـــو شـــوێنێك بۆ خوداپەرســـتی و نوێژکـــردن تێیـــدا.



هەروەها هەردوو هـۆزی ﴿ئەوس﴾ و ﴿خەزرەج﴾ی ئاشـتکردەوە و ئاشـتی بەرقەرارکرد لەنێوانیاندا، کـە دوو هۆزی گـەورەی مەدینـە بـوون و چەند سـاڵێك بـوو شـەڕ و دووبەرەکی لەنێوانیانـدا بوو.

پاشـان برایەتی خسـتە نێوان هـەردوو کۆمەڵـی کۆچکردووەکانی خەڵکی مەککـە و پشـتیوانانی مەدینەوە.

هەروەهـا پەیماننامەیەکی نووسـی لەنێـوان هەموو دانیشـتووانی شـاری مەدینەدا، لەسـاڵی دووەمـی کۆچیدا جەنگـی ﴿بەدر﴾ی گەورە لەنێـوان موسـوڵمانان و بێباوەڕەکانی قورەیشـدا ڕوویدا، کە تێیدا موسـوڵمانان سـەرکەوتنیان بەدەستهێنا.






Scanned with CamScanner

هەروەهـــا دواى جەنگــى بـــەدر جەنگـــى «ئوحود»يـش لە ســاڵى سـێيەمى كۆچيدا ڕوويـــدا، كە لە ســـەرەتادا موســـوڵمانان ســـەركەوتن، بەڵام لەكۆتاييدا شكســـتيان هێنـــا. هەروەها لە ســـاڵى پێنجى كۆچيشـــدا جەنگـــى «خەندەق» ڕوويـــدا، كە بـــە يارمەتى خـــوداى گـــەورە ســـەركەوتنێكى گەورەيان بەدەســـتهێنا. دواى ئەوەى لە ساڵى شەشـــەمى كۆچيدا پێغەمبەر ﷺ لەگـــەڵ موســـوڵمانەكان بـــەرەو مەككـــە بەڕێكەوتن بـــۆ ئەنجامدانى عومرە، بەڵام قورەش نەيانهێشـــت بچنە مەككـــەوە، بۆيە ڕێككەوتنێك بەنـــاوى «ڕێككەوتننامـــەى حودەيبييـــە» لەنێـــوان موســـوڵمانان و قورەيشـــدا مۆركرا، بـــەڵام دواتر قورەيشـــييەكان ئـــەو ڕێككەوتنەيان شـــكاند و پەيمانەكەيـــان بەجـــێ نەهێنا.



بۆیە پێغەمبەرﷺ و موسوڵمانان خۆیان ئامادەکرد و ڕۆیشتن بەرەو شاری مەککە و ئازادیان کرد و هەموو ئەو بتانەی لەناو کەعبەدا بوو هەموویان شکاندن و کەعبەیان پاککردەوە.

لە ساڵی ١٠ی کۆچیدا پێغەمبەری خۆشەویستمانﷺ لەگەڵ هاوەڵەکانیدا حەجی کرد کە بە حەجیماڵئاوایی ناسراوە. دواتر گەڕایەوە بۆ مەدینە.

پێغەمبەری خۆشەویستمانﷺ لە ١٢ی ڕەبیعی یەکەمی ساڵی یازدەی کۆچیدا کۆچی دوایی کرد.



